TISHK
تیشك

# ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا

## لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی

نووسینی:
د. شەریف عەبدولعەزیم

وەرگێڕانی:
وەزیر حەمەسەلیم




# ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا

## لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی

نووسینی: د. شەریف عەبدولعەزیم

وەرگێڕانی: وەرزێر حەمەسەلیم

٢٠٠٦ زایینی - ١٤٢٧ كۆچی

**ناوی کتێب:** ئازادیی ڕادەربڕین لە ڕۆژئاوا، لە سەلمان ڕوشدییەوە بۆ ڕۆجیە گارودی

**نووسەر:** د. شەریف عەبدولعەزیم

**وەرگێڕ:** وەرزێر حەمەسەلیم

**ژمارەی سپاردن:**

**ساڵی چاپکردن:** ٢٠٠٦

**نۆرەی چاپ:** یەکەم

**شوێنی چاپ:**

لە بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (تیشک) زنجیرە (٧)

tishkbooks@yahoo.com

## ناوەڕۆک( ژمارەکانی لاپەڕەکان هی کتێبە چاپکراوەکەن )

# چۆن لە ئازادی تێبگەین؟

هیچ ڕۆشنبیری و شارستانیەتییەك لەم سەر زەمینەدا بە درێژایی مێژوو هەتا ئەمڕۆ بەدی ناكرێت كە ئازادی ڕەهای بۆ مرۆڤەكان دابین كردبێت.

خۆ ئەگەر لێرەو لەوێ هەندێ لە حكومەت و دەوڵەتەكان لە ڕێگەی دەستورو یاساوە ئەو ئازادییەیان پەسەند كردبێت ئەوا ڕاستەوخۆ چەند بەشێك لەو ئازادییە لە لایەن كۆمەڵگەوە ڕەتكراوەتەوەو حكومەتیش ناچار بووە مل بە داواكارییەكانی كۆمەڵگە بدات، دیارە هەموو كۆمەڵگەیەكیش خاوەنی كۆمەڵێك یاساو ڕێساو دابونەریتی خۆیەتی، كە زۆرجار هەندێك لەوانە بە هێڵی سوور ناوزەد دەكرێن و بەزاندنیان یاساغ و قەدەغەیە. مرۆڤیش وەك تاك كەسێكی كۆمەڵایەتییەو موڵكی كۆمەڵگەكەیەتی و پابەندە بەو ڕێنمایی و تەڵقینانەی كە كۆمەڵگە هەر لە سەرەتاوە پێی گۆش كردووە بوونەتە بەشێك لە سرووشت و بیركردنەوەی، ڕاستە هەموو مرۆڤێك لە ناخی خۆیدا كۆمەڵێك حەزو ویست و داخوازی هەیەو دەخوازێت مومارەسەیان بكات و بیانهێنێتەدی، بەڵام دواجار زۆرێك لەو حەزو خۆزگانە لەگەڵ سنوورو كۆت و بەندەكانی كۆمەڵگەدا بەریەك دەكەون و لەبەرئەوە جێبەجێكردن و تەنانەت دەربڕینیشیان زۆرجار دەبنە مەحاڵ، لەم ڕوانگەیەشەوە مرۆڤ دەبێتە خاوەنی دوو كەسایەتی، كەسایەتییەكی سەربەخۆو كەسایەتییەكی كۆمەڵایەتی، بۆیە ئەوانەیان كە دەخوازن كەسایەتییە سەربەخۆكەیان دەربخەن و نایانەوێت لەگەڵ كۆمەڵگەدا بگونجێن و بە پێچەوانەی شەپۆلەكانی ناوەوە مەلە دەكەن كەسانێكن لە لایەن كۆمەڵگەوە هەمیشە بە یاخی و تەنانەت شێتیش لە قەڵەم دەدرێن.

گومانیشی تێدانییە ئازادی بە هەموو جۆرەكانییەوە مافێكی بنەڕەتیی هەموو مرۆڤێكەو لەسەر دەسەڵات و دەوڵەت پێویستە بۆی دابین بكات و بواری مومارەسەكردنیشی بۆ بڕەخسێنێت، بەڵام وەك ئاشكرایە مرۆڤەكانیش لە هەر شوێنێكدا بن هەموویان وەك یەك نین و لە زۆر لایەن و ڕووەوە لە یەكتری جیاوازن، تەنانەت ئەگەر ئەو كەسانە ڕۆڵەی یەك وڵات و یەك كۆمەڵگەش بن، وەلێ لە ڕووی ئایین و مەزهەب و ڕەگەزو ڕەنگ و زمانەوە جیاوازن و لە هەمانكاتیشدا یەك كۆمەڵگە، یان یەك وڵات كۆی كردونەتەوە، خۆ ئەگەر ئەو كەسانە لە هەموو ئەو لایەنانەشدا وەك یەك بن ئەوا لە ڕووی بۆچوونی سیاسی و لایەنگری حزبی و بۆچوونی فیكرییەوە جیاوازن، بۆیە پێویستە هەموو دەستەو گروپێك لەوانە ئازادی خۆی هەبێت و بتوانێت ئازادانە گوزارشت لە بیروڕاو بۆچوون و بیركردنەوەو خواستەكانی خۆی بكات، بەڵام نابێت ئەوەشمان لە یاد بچێت هەر گروپ و كەسێكی دیاریكراو وەك چۆن ئازادی بە مافی ڕەوای خۆی دەزانێت و مومارەسەكردنیشی بە مافێكی شەرعیی و یاسایی خۆی دەبینێت، پێویستە ئەوەش بزانێت كە كەسانێكی دیكەش هەن جگە لەو هەمان ئەو مافەی ئەو هەیەتی و دەیخوازێت، ئەوانیش هەیانەو ناكرێت لە مومارەسەكردنی ئەو ئازادییەدا كە بە مافی خۆی دەزانێت هەمان ئەو مافەی ئەوانی دیكە پێشێل بكات.

لێرەوەیە ئازادی ڕەهابوونی نابێت و ئەگەر بوو ئەوا ئەو ئازادییە دەبێتە گێرەشێوێنی و ئاژاوە، بنەماو پرنسیپەكانی كۆمەڵگە لەبنەوە دەردێنێت و كۆمەڵگە بەرەو دوژمنایەتی و لەبەریەك هەڵوەشاندنەوە دەبات، یان ئەگەر هەر دەستەو گروپێك ئەو ئازادییە تەنها بە مافی خۆی بزانێت و بە كەسانی دیكەی جگە لە خۆیانی ڕەوا نەبینن و هەستی ئەوی دی لەبەرچاو نەگرێت و لە ڕوانگەی خۆ بە زلزانین و ئەوی دی بە كەم زانین مامەڵە بكات، ئەوا لەمەشیاندا ئازادی دەبێتە ئامرازێك بۆ چەوساندنەوەو سەركوتكردن، ئیدی هیچ مانایەكیش بۆ ئاشتیی كۆمەڵایەتییانەو پێكەوە ژیان و ڕێزگرتن و خوێندنەوەی ئەوی دی نامێنێت.

هەر بۆیە ئازادی كە هەبوو پێویستە بۆ هەمووان بێت، وەك یەك و بەبێ جیاوازی ڕەنگ و ڕەگەزو ئایین و مەزهەب و بۆچوونی سیاسیی و كۆمەڵایەتیی و ڕۆشنبیریی.. هتد، ئەگەر نەشبوو ئەوە مافێكی زەوتكراوو لەدەستچووی هەموو مرۆڤێكەو پێویستە هەوڵ بۆ گەڕاندنەوەو بەدەستهێنانەوەی بدرێت.

لە لایەکی تریشەوە سنوور دانان و دیاریکردنی کۆت و بەند بەسەر ئازادییەوەو کێشانی هێڵە سوورەکان مانای نەبوونی ئازادیو پیشێلکردنی ئەو مافە سەرەکییەی مرۆڤەکان نییە، هێندەی ئەوەی بەخشینی مافێکی دیکەیە بە کەسانێکی دیکەو هەوڵدانە بۆ ڕاگرتنی هەست و ڕێزگرتنی بیروبۆچوونەکانیان و هەنگاوێکە بۆ هێنانەدی ژیانێکی هێمن و ئارامی کۆمەڵایەتیانەو دواجاریش بۆ پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی..

**وەرگێڕ**

**هەڵە بجەی شەهید**

## دەستپێك

دادگاییکردنی بیریاری موسڵمانی فەرەنسی (ڕۆجیە گارودی) لە فەرەنسادا، بەهۆی نووسینی کتێبی (الأساطیر المؤسسة للسیاسة الأسرائیلیة)و پاشان حوکمدانی بە بڕی (٢٠) هەزار دۆلار غەرامە بە پێی یاسای "ڤابیوس ـ جیسو" شەپۆلێك لە تووڕەیی و ناڕەزایی لە نێوەندی ڕۆشنبیرانی میسرو جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا تەقاندەوە، لە هەمانکاتدا ئەو شۆكو سەرسوڕمانەش کەم نەبوو کە تێکەڵ بەو شەپۆلە تووڕەییە بوو وە پرسیارێکی لە هەناوی خۆیدا هەژاند، ئەویش ئەوە بوو "چۆن لە ڕۆژئاواو بە تایبەتیش لە وڵاتێکی وەك فەرەنسادا وەها دادگاییەك ئەنجام دەدرێت و چۆن یاسایەکی لەو جۆرە پیادە دەکرێت کە تەنها گفتوگۆکردنیش لە بارەی تاوانەکانی هیتلەرەوە دژ بە یەهود یان دادی دادگاکانی نورمبرغ یاساغ دەکات و سەرپێچیکاران بە زیندانی کردن یان غەرامە کردن سزا دەدات؟!" هەر ئەمەش چەندین پرسیاری دیکەی وروژاند سەبارەت بە ڕاستییەتی ئازادی ڕادەربڕین و گوزارشت کردن لە ڕۆژئاوادا، سنووری گونجاندنی دروشمەکانی ڕۆژئاوا لەگەڵ هەڵسوکەوتە ڕۆژئاواییەکاندا لەو بوارەدا، ئەو ڕۆڵەی کە (لۆبی سەهیۆنی) لە یاساغ کردنی لێپرسینەوەو ڕەخنەلێگرتنی ڕەوای سەهیۆنیەت لە میدیاکانی ڕۆژئاوادا دەیگێڕێت، لە ڕاستیشدا پێکهاتەی ئازادی ڕادەربڕین لە ڕۆژئاوادا ئاڵۆزەو شیکارە سادەو ئامادەکراوەکانی وەك پڕۆتستۆکردنی ڕەهای ڕۆژئاوا یان بێتاوانکردنی لە تێگەشتنی ئەو ئازادییەدا سوودێکی نییە، ئەو پرسیارانەی کە دادگاییکردنی (گارودی)و بوونی یاسایەکی وەك یاسای "ڤابیوس ـ جیسو"، دەیانوروژێنێت، تەنها تێپەڕاندنی مەودای ئەو باوەڕو پابەندبوونەیە کە ڕۆژئاوا بە ئازادی ڕادەربڕین و گوزارشت کردنەوە هەیەتی تا ئەو جێگەیەی " کە ئایا ئەم ئازادییانە بە پلەی یەکەم ڕەهان یان نا؟ ئەگەر ڕەهانین، ئەی تاکو چ ڕادەیەك دەتوانرێت سنووریان بۆ دیاری بکرێت؟ بۆچی؟ کێیە ئەو کەسەی کە دەسەڵاتی ئەو سنووردانان و بەستنەوەیەی هەیە؟ هتد.. ئەم مەسەلەیەش پێویستی بە کەمێك شیکردنەوەو تێڕامان هەیە.

**د. شریف عبدالعظیم**

## ئازادی ڕەهای رادەربڕین !

"گارودی" یەکەم کەس نییە لە فەڕەنسادا کە بە هۆی کتێبێکەوە کە نووسیویەتی یان ڕایەکەوە کە دەریبڕیبێت دادگایی کرابێت، دواهەمین کەسیش نابێت! ئەم مەسەلەیەش تەنها پەیوەست نییە بە فەڕەنساوە، چونکە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوا چەندین یاسایان تێدایە کە بڵاوکردنەوەی هەندێك بیروڕاو دەمکوتان لە هەندێك مەسەلە قەدەغە دەکات، ئەم کۆت و بەندەی کە بە سەر ئازادی ڕادەربڕیندا سەپێنراوە، بە تەنها دەستێوەردانی ڕاستەوخۆی دەوڵەت لە ڕێگەی دەسەڵاتی دادوەرییەوە ناگرێتەوە، بەڵکو بەشداریکردنی کۆمەڵگە لە سەپاندنی کۆت و بەندی زیادە بە سەر ئازادی ڕادەبڕیندا دەبێتە هۆی زیاتر بەرتەسککردنەوەی بواری ئەو ئازادییەیە کە لە بەردەم نووسەران و ڕۆژنامەنووسان و بیریاراندا هەیە، نموونەکانیش لەم ڕووەوە زۆرو جۆراوجۆرن و پێویست بە کەمێك درێژە پێدان دەکەن.

### ئەڵمانیا

.. کتێبی "کفاحي" کە نووسینی هیتلەرە کڕین و فرۆشتن و چاپکردنی لە ناو سنووری ئەڵمانیادا قەدەغەیە، هەروەها چاپکردن و بڵاوکردنەوەی هەر جۆرە وتارێك یان کتێبێك بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان لایەنگری نازییەت بکات قەدەغەیە، تەنانەت هوتافە نازییەکان ئەگەرچی بۆ شۆخی و گاڵتە کردنیش بێت قەدەغەن، هەر ئەم قەدەغە کردنەش بووە هۆی دروستکردنی کێشەیەك بۆ یاریزانی تۆپی پێی میسری (هانی ڕەمزی) لە ئەڵمانیا کاتێك لە یەکێك لە ئاهەنگەکاندا هەر بۆ خۆشی هەستا بە ئەنجامدانی سڵاوکردنە بەناوبانگەکەی نازییەت.

.. ساڵی (١٩٩١) "جنتر دیکیرت"ی سەرکردەی "پارتی نیشتمانی دیموکراتیی ئەڵمانیا" کە پارتێکی ڕاستڕەوی توندڕەوە، هەستا بە بەستنی "وۆرك شۆپێك" کە تیایدا میوانداری وانەبێژێکی ئەمەریکی کردبوو، ئەو وانەبێژە لە میانەی وتارەکەیدا ڕایگەیاند "کوشتنی یەهود بە هۆی غازەوە هەرگیز نەبووەو ڕوووینەداوە"، لە ئەنجامی ئەمەشدا، "دیکیرت" درایە دادگا، بە پێی ئەو یاسایەی کە بەرپاکردنی ڕق و کینە لە نێوان ڕەگەزەکاندا قەدەغە دەکات، سزا دراو ماوەی ساڵێك زیندانی کردنی لەگەڵ ڕاگرتنی جێبەجێکردنەکەیدا بەسەردا سەپێنرا، زیاد لەوەش غەرامەیەکی سووکی لێسەنرا ئەمەش ئەو دادوەرانەی کە دادگایی "دیکیرت"یان کرد بوو ڕووبەڕووی تووڕەیی و ڕەخنەی داوەرەکانی دیکە کردەوە، چونکە سزاکەیان بەکەم و سووك دەزانی، ئەم ڕەخنانەش کە ڕووبەڕووی دادوەرەکان کرایەوە وای لە دادگای فیدراڵی ئەڵمانیا کرد دەست وەربداتە نێو کێشەکەو ئەو حوکمەی کە بۆ "دیکیرت" دەرچوو بوو هەڵیوەشاندەوەو فەرمانیدا بە سەرلەنوێ ئەنجامدانەوەی دادگاییکردنەکە.

.. لە مانگی نیسانی ساڵی (١٩٩٤)دا، دادگای دەستووریی ئەڵمانیا ڕایگەیاند هەر هەوڵێك بۆ نەسەلماندنی ڕووداووی "هۆڵۆکۆست" ناچێتە خانەی پارێزگاریکردن لە مافی ئازادی ڕا دەربرین کە دەستووری ئەڵمانی دەیبەخشێتە کەسەکان، ئەم ڕاگەیاندنەی دادگاش وای لە پەرلەمانی ئەڵمانیا کرد کە یاسایەك دابڕێژێت تیایدا هەر هەوڵێك بۆ نەسەلماندنی ڕووداووی هۆڵۆکۆست بە تاوان بداتە قەڵەم و سزای ئەو کەسەش کە بەم تاوانە هەستێت بەندکردنە بۆ ماوەی پێنج ساڵ، بە چاوپۆشی لەوەش ئەو کەسە بڕوای بەو نەسەلماندنە هەبێت یان نەبێت.

.. خانەی بڵاوکردنەوەی ئەڵمانی کتێبی (العين بالعين)ی ئەمریکی کە لە ساڵی ١٩٩٣دا بڵاوکراوەتەوەو ئەو خانەیەش بە زمانی ئەڵمانی بڵاویکردەوە، هەستا بە کێشانەوەو لەناوبردنی هەموو دانەکانی چاپە ئەڵمانییەکەی ئەو کتێبە لە بازاڕەکاندا، لە ترسی ئەوەی نەبادا بکەوێتە ژێر زەبرو زۆری یاساو وروژاندنی توڕەیی ڕای گشتیی، چونکە ئەو کتێبە باس لەوە دەکات کە "ستالین" لە جەنگی جیهانی دووهەمدا بە ئەنقەست یەهودییەکانی هەڵبژاردووە بۆ ئەنجامدانی کاری پۆلیسی نهێنی لە پۆڵەندەدا.

### نەمسا

لە نەمسادا مرۆڤ سزای بەندکردنی بە سەردا دەسەپێت ئەگەر بێتو بوونی ئەو ژوورە غازیانە نەسەلمێنێتو بڕوای پێیان نەبێت کە نازییەکان لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەمدا دایان مەزراندوون، لە ساڵی (١٩٩٢)دا حکومەتی نەمسا هەستا بە هەمواركردنی یاسایەك، بەشێوەیەك كە هەر هەوڵێك بۆ "نەسەلماندن یان بێبایەخكردن، یان ستایشكردن یان بیانوو هێنانەوە بۆ هەر تاوانێك لە تاوانەكانی نازییەت بە تاوان لەقەڵەم دەدات، ئەگەرچی ئەوەش وتەیەكی نووسراوبێت یان بەزارەكی بڵاوبكرێتەوە".

### دانیمارك

یاسای دانیماركی هەر جۆرە هەڕەشەو سووكایەتی پێكردنێك یان دابەزاندنی شانوشكۆی هەر مرۆڤێك بەشێوەیەكی ئاشكرا بە هۆی ئایین[1] یان ڕەگەز یان باكگراوندی ئەتنی یان بۆچوونی سێكسییەوە قەدەغە دەكات، بە هۆی ئەم یاسایەوە ئافرەتێكو نووسەری ڕۆژنامەیەك ڕووبەڕووی هەوڵدان بۆ درانە دادگا بوونەوە، چونكە ئافرەتەكە وتارێكی بۆ ڕۆژنامەكە نوسیبوو كە تیایدا لادانی سێكسی بە "خراپترین جۆرەكانی زینا" وەسف كردبوو.

### یابان

گۆڤاری "ماركو بولو" لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٩٥دا وتارێكی بڵاوكردەوە، باس لە خستنەڕووی حەقیقەتی مێژوویی نوێ دەكات، ئەوە ڕوون دەكشاتەوە، ئەو ژوورە غازیانەی كە دەگوترێت لە میانەی جەنگی جیهانی دووەمدا دامەزراون هیچ بنەمایەكی مێژوویی و باوەڕ پێكراویان نییە.. ئەوەبوو ئەم وتارە كاردانەوەیەكی خێراو توندوتیژی لێكەوتەوە، بە جۆرێك دامەزراوە پیشەسازییە گەورەكانی وەك "فولكس واگن"و "میتسوبیوشی" هەستان بە ڕەتكردنەوەی گرێبەستی ئەو ڕیكلامانەی كە لەگەڵ گۆڤارەكەدا بەستبوویان، ئەمەش بۆ ناڕەزایی دەربڕین بەرامبەر بە بڵاوكردنەوەی ئەو وتارە، ئەمەش وای لە خاوەنی گۆڤارەكە كرد كە هەموو ژمارەكانی ئەو گۆڤارە لە بازاڕەكاندا كۆبكاتەوەو هەموو نووسەرانی گۆڤارەكەش دەربكات، نەك هەر هێندە، بەڵكو بۆ دواجار خودی گۆڤارەكەشی داخست.

### ئوستراليا

لە ئوستورالیادا هەر نووسراوێك كە لە ڕێزی گروپە ڕەگەزییەكان بهێنێتە خوارەوە بە پێی ئەو یاسایەی كە جیاوازی نێوان ڕەگەزەكان قەدەغە دەكات، بە یاساغو قەدەغە كراو ناوزەد دەكرێت، ئەم یاسایەش ساڵی (١٩٨٩) دەركراوەو سزای هەموو نووسەرو خاوەن بڵاوكراوەیەك بە غەرامەیەك دەدات كە دەگاتە (٤٠ هەزار دۆلاری ئەمریكی).

### بەریتانیا

.. بەریتانیا تا ئێستاش لە هەموو ئینگلتەرەو وێڵزدا كار بەو یاسایە دەكات كە جنێودان بە پیرۆزییەكان قەدەغە دەكات (ئەم یاسایە لە سكۆتلەنداو ئایرلەندەی باكووردا كاری پێناكرێت).

لەبەرئەوە كاتێك كە دەرهێنەری دانیماركی (چینز سۆرسن) ڕایگەیاند بە نیازە لە ئینگلتەرادا فیلمێك دەربارەی "ژیانی سێكسی" حەزرەتی مەسیح دەربهێنێت (ئەمەش بووە هۆی بەرپابوونی شەپۆلێكی تووڕەیی توند لە لایەن دامەزراوە ئاینییەكانی ئەوروپاوە لە سەرووشیانەوە ڤاتیكانو ئەسقەفیەتی كانتربری)، "جیمس كالاهان"ی سەرۆك وەزیرانی ئەو كاتەی بەریتانیاش هۆشداریدا كە هەر هەوڵێك بۆ دەرهێنانی فلیمێكی لەو جۆرە لە ئینگلتەرەدا بە پێی یاسای قەدەغەكردنی جنێودان بە پیرۆزییەكان ڕووبەڕووی دادگا دەبێتەوە، ئەمەش وای لە دەرهێنەرەكە كرد لە هەوڵەكەی پاشگەز بێتەوەو بەمجۆرەش بەرهەمهێنانی فلیمەكە سەری نەگرتو ئەنجام نەدرا.

[1] ـ لەگەڵ بوونی ئەم یاسایەشدا لە ٢٠٠٥/٩/٣٠ دا ڕۆژنامەی (بۆلاند بۆستن)ی دانیماركی (١٢) كاریكاتێری گاڵتە ئامێزی لە سەر كەسایەتی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) بڵاوكردەوە، كەچی ئەمە لە دانیماركدا بە ئازادی بیرو ڕا لێكدرایەوە، سەرەڕای ئەو هەموو ناڕەزاییانەی وڵاتانی ئیسلامیش هیشتا سەرەك وەزیرانی ئەو وڵاتە ئامادە نەبوو پۆزش بۆ موسڵمانان بێنێتەوەو پاش چوار مانگیش ئەوسا ڕۆژنامەكە لێبورن نامەیەكی ئاراستەی موسڵمانان كرد، سەبارەت بەم لێبوردن نامەیەش (راسمۆسنی) سەرەك وەزیرانی دانیمارك ڕایگەیاند: "بەم پۆزش هینانەوە خۆشحاڵم، لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانم دەستكاری ئازادی بیرو ڕا لە وڵاتەكەمدا بكەم!! "وەرگێر".

ـ لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٧٦)دا ڕۆژنامەی "Gay news"ی تایبەت بە هەواڵی ئەو پیاوانەی لە ڕووی سێکسییەوە لادەر (شاز)ن هەستا بە بڵاوکردنەوەی قەسیدەیەکی شاعیری بەریتانی "جیمس کیرکوب" کە تیایدا بە شێوەیەکی نەشیاو باس لە حەزرەتی مەسیح دەکات، ئەمەش بووە هۆی وروژاندنی تووڕەیی "یەکێتی بینەران و بیسەرانی ئینگلیز" کە ئەرکەکەی بریتییە لە چاودێرکردنی میللییانەی هەموو ئەو بابەتانەی کە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاودەکرێنەوە یان لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن و فلیمە سینەماییەکانەوە پەخش دەکرێن، سەرۆکی ئەم یەکێتییە سەرنووسەری ڕۆژنامەکەو ئەو کۆمپانیایەی کە ئەرکی بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەکەی لە ئەستۆدایە بە تۆمەتی جنێودان بە پیرۆزییەکان دایە دادگا، داداگاییکردنەکەش لە مانگی تەمموزی ساڵی (١٩٧٧)دا ئەنجامدرا، سەرەڕای هەموو ئەو هەوڵە بە فێڕۆ چووانەی کە لە لایەن دەستەی پارێزەرانەوە درا بۆ ڕازیکردنی سوێندخۆرەکان (محلفين)[1] بەوەی کە قەسیدەکە واتاو مەبەستی ئەوە نەبووە کە سووکایەتی بە ئایینی مەسیحی بکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە مەبەستی قەسیدەکە بریتی بووە لە وێناکردنی ئەو پەیوەندییە سۆزدارییەی کە شاعیر بەخودی مەسیحەوە دەبەستێتەوە، بەڵام دەستەی سوێندخۆرەکان ئەم بەرگریکردنەیان قبووڵ نەکردو بە زۆرینەی (١٠) دەنگ بەرامبەر بە (٢) دەنگ، بە تۆمەتی ئەنرخاندنی هەستی مەسیحییەکان لە ئینگلتەراداو سوکایەتی کردن بە پیرۆزییەکان ڕۆژنامەکەیان پرۆتستۆ (ئیدانە) کرد. پاش بڕیاری دەستەی سوێندخۆرانیش دادوەر ماوەی نۆ مانگ زیندانیکردنی لەگەڵ ڕاگرتنی جێبەجێکردنەکەی بۆ سەرنووسەری ڕۆژنامەکە بڕییەوەو بە بڕی (٥٠٠) جونەیهی ئیستەرلینی غەرامە کرا، هەروەها کۆمپانیاکەش بە بڕی (١٠٠٠) جونەیهی ئیستەرلینی و گرتنە ئەستۆی بڕی تێچوونی دادگاییکردنەکە غەرامەکرا، ئەوەبوو ڕۆژنامەکە لە ساڵی (١٩٧٨)دا لە بەردەم دادگای پێداچوونەوەی ئینگلتەرەدا داوای پێداچوونەوەی حوکمەکەی کرد، بەڵام دادگاکە بڕیارەکەی دادگای پەسەند کردو جارێکی تریش ڕۆژنامەکە لە ساڵی (١٩٧٩)دا هەمان داوایان پێشکەش بە بەشی قەزایی ئەنجومەنی لۆردەکانی بەریتانیا کردەوەو لەمجارەشدا کە جاری سێیەم بوو نەیانبردەوەو داواکەیان لەدەستدا، چونکە دادگای باڵای بەریتانیا هەموو ئەو حوکمانەی پەسەند کرد کە پێشتر دژ بە سەرنووسەری ڕۆژنامەکەو کۆمپانیاکە دەرکرابوون.

پاش بڕیاری دادگای باڵا، لەلایەن ئەنجومەنی گشتی بەریتانیاشەوە چەند هەوڵێك درا بۆ کۆتایی هێنان بە کار پێنەکردنی یاسای جنێودان بە پیرۆزییەکان، بەڵام هەوڵەکان سەرکەوتوو نەبوون، چونکە هیچ کام لە ئەنجومەنی گشتیی و ئەنجومەنی لۆردەکان ڕازینەبوون بەوەی دەستکاریی ئەو یاسایە بکرێت، هەرچەندە یاساکە لەلایەن ژمارەیەك لە پەرلەمانتارانەوە ڕەخنەی لێگیرا، بەوەی کە ئەو یاسایە بە تەنها ئایینی مەسیحی لە جنێوپێدان دەپارێزێت و ئایینەکانی دیکەی ناو بەریتانیای پشتگوێ خستووە، سزاکەی تەنها ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە دەست بۆ پیرۆزییەکانی مەسیحییەت دەبەن بەبێئەوەی ڕەچاوی مەبەست و نییەتی ئەو کەسە بکرێت کە بە جنێودان بە پیرۆزییەکان تاوانبار دەکرێت، دوای ئەوەش چەند هەوڵێکی دیکە دران بۆ ئەوەی مەودای یاساکە فراوانتر بکرێت، بۆ ئەوەی سزاکە ئەوانەش بگرێتەوە کە جنێو بە پیرۆزییەکانی ئایینەکانی دیکەی ناو ئینگلتەرا دەدەن، بەڵام هەموو ئەو هەوڵانەش دیسانەوە بە فیڕۆ چوون و سەرنەکەوتن.

ـ پاش بڵاوبوونەوەی کتێبی "آيات شيطانية" لە ساڵی (١٩٨٨)دا، مسوڵمانان لە بەریتانیادا هەوڵیاندا یاسای قەدەغەکردنی جنێودان بە پیرۆزییەکان دژ بە نووسەری کتێبەکە (سەلمان ڕوشدی) بەکاربهێنن، بەڵام سەرکەوتو نەبوون، چونکە ئەو یاسایە تەنها سزای ئەو کەسانە دەدات کە جنێو بە پیرۆزییەکانی مەسیحییەت دەدەن، بەم شێوەیەش سەلمان ڕوشدی کە سووکایەتی بە پیرۆزییەکانی ئیسلام کردبوو بە دەرچوو، لە هیچ یاسایەکی بەریتانی دانەنرا، ئەوەی لەم مەسەلەیەدا مایەی پێکەنینە ئەوەیە بەریتانیا کە ڕێگەی بە بڵاوکردنەوەو دەستاو دەست پێکردنی کتێبەکەدا بە بیانووی ئازادی ڕادەربڕین، پاش ئەوە هەستا بە ڕێگرتن لە هاتنە ناوەوەی فیلمێکی پاکستانی بۆ ناو بەریتانیا، چونکە

[1] ـ لە دادگاکانی ڕۆژئاوادا دەستەیەك نوێنەرایەتی مافەکانی کەسێتی دەکەن کە بە (هيئة المحلفين) واتە (دەستەی سوێندخۆران) ناسراون، هەمان ئەرکی داواکاری گشتیی (المدعي العام)و پارێزەرانی مافی کەسێتییان لە ئەستۆدایە. "وەرگێڕ".

ناوەڕۆکی فیلمەکە گاڵتەکردن بوو بە "سەلمان ڕوشدی و کتێبەکەی"!.

. ساڵی (١٩٨٩) دەستەی چاودێر بەسەر بەرهەمە هونەرییەکانی بەریتانیاوە هەستا بەڕەتکردنەوەی نمایشکردنی فیلمیکی دیکۆمێنتاری لە سەر شاشەکانی تەلەفزیۆنی بەرتیانیا، فیلمەکەش سەبارەت بە "تیریزا"ی ژنە قەشە بوو کە لە سەدەی شانزەهەمدا لە بەرتیانیادا ژیاوە، بەو بیانووەی ناوەڕۆکی فیلمەکە دەتوانرێت بەوە لێکبدرێتەوە کە سووکایەتی کردنە بە ئایینی مەسیحییەت.

**فەرەنسا**

. ساڵی (١٩٩٠) ئەنجومەنی گەلی فەرەنسی یاسای "ڤابیۆس ـ جیسۆ"ی پەسەند کرد، ئەم یاسایە تەنانەت گفتوگۆ کردنیش لە بارەی حەقیقەتی ڕووداوی هۆلۆکۆست لە جەنگی جیهانی دووهەمدا قەدەغە دەکات.

. لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٥)دا "برنارد لویس"ی مامۆستای زانکۆی "برنستون"ی ئەمریکی بە بڕی (١٠) هەزار فرەنکی فەرەنسی کە دەکاتە نزیکەی (٢٠٦٢) دۆلاری ئەمریکی غەرامە کرا، چونکە ناوبراو ئەوەی ڕەد کردەوە کە گەلی ئەرمەن لە سەر دەستی دەوڵەتی عوسمانی و لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ڕووبەڕووی کۆمەڵکوژی بوونەتەوە، هەروەها جەختیشی لەسەر ئەوە کردەوە کە زۆرینەی ئەرمەنییەکان بەهۆی "نەخۆشی و برسێتی و ماندوو بوون و سەرماوە گیانیان لەدەستداوە"، هەر بەو هۆیەشەوە کاتێك ڕۆژنامەی "لۆمۆندی فەرەنسی" لە تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٣)دا ئەم پرسیارەی ئاراستەی نابراو کرد کە "بۆچی تورکیا ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە دان بەوەدا بنێت ئەو هەستا بێت بە قەتڵو عامکردنی ئەرمەنییەکان؟" ئەو لە وەڵامی پەیامنێری ڕۆژنامەکەدا وتی:"مەبەستت ئەوەیە بۆچی تورکیا ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە دان بە بۆچوونی ئەرمەنیەکاندا بنێت سەبارەت بەوەی کە ڕوویداوە؟".

ئەم وتانەی"لویس" بووە هۆی ناڕەزایی دەربڕین لە لایەن ئەرمەنە دانیشتوەکانی ناو پاریس، هەروەها (٣٠) مامۆستای زانکۆ هەستان بە نووسینی وتارێکی کراوە تیایدا "لویس بە خیانەتکردن لە حەقیقەت و سوکایەتی کردن بە قوربانیانی کارە وەحشیانەکەی تورکیا تاوانبار دەکەن"، هەروەها جالیەی ئەرمەنی لە سەرەتاوە هەوڵیاندا بە پێی یاسای ڤابیۆس ـ جیسۆ کە لە ساڵی (١٩٩٠) دەرکرا، لویس بدەنە "دادگای تاوانەکان"، بەڵام ئەرمەنیەکان پاشان ئەوەیان لە لا ئاشکرا بوو کە ئەو یاسایە تەنها تایبەتە بە ڕەتکردنەوەی هۆلۆکۆست کە بەرامبەر یەهودییەکان ڕوویداوەو ناتوانرێت بەسەر هەموو کۆمەڵکوژییەکی دیکەدا جێبەجێ بکرێت، شایانی باسە "برنارد لویس" مێژوونوسێکی ناسراوەو تایبەتمەندی وردیشی برتییە لە "مێژووی دەوڵەتی عوسمانی"و بە یەکێك لە شارەزاترین مێژوونوسەکانی ئەو بوارە دەژمێردرێت.

. لە مانگی ئابی (١٩٩٥)دا دەسەڵاتدارانی فەرەنسی هەستان بە ڕێگرتن لە هاتنە ناوەوەی کتێبێك بۆ ناو فەرەنسا کە لە لایەن "لیژنەی جەزائیریە ئازادیخوازەکانەوە" لە سویسرا دەرکرا بوو، بە بیانووی ئەوەی بڵاوبوونەوەی ئەو کتێبە دەبێتە هۆی دروستکردنی کێشە بۆ ڕەوش و یاسای گشتیی لە فەرەنسادا، چونکە "زمانی کتێبەکەش دژ بە فەرەنسایە" هەروەك وتەبێژی فەرمی وەزارەتی ناوخۆی فەرەنسا ئەوەی ڕاگەیاند.

ـ لە کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٩٨)دا، دادگایی (ڕۆجیە گارۆدی) بە هۆی کتێبەکەیەوە (الأساطیر المؤسسة للسیاسة الأسرائیلیة) ئەنجامدراو (٢٠) هەزار دۆلار غەرامە کرا، کار بەوەشەوە نەوەستا، بەڵکو گارودی چەندین پەیوەندی تەلەفۆنی پێوەکرا، کە هەڕەشەی کوشتنی لێدەکرا، دەستدرێژی کرایە سەر هەموو ئەو کتێبخانانەی کە کتێبەکەیان تێدا دەفرۆشرا، تاوای لێهات ئەو کتێبخانانە وازیان لەو کارە هێنا، هەروەها دەستدرێژی جەستەیی کرایە سەر بڵاوکاری کتێبەکەو کتێبخانەکەشی تاڵان کراو بە هۆی (نارنجۆکی مۆلۆتۆفنیشەوە) هێرشکرایە سەر ئەو کتێبخانەیەی کە لە (ئەسینا)دا هەیبوو، پاشانیش لە نێو دادگادا دەستدرێژی کرایە سەر کۆمەڵێك ڕۆژنامەنووسی عەرەب و ئێرانی و هەتا میترۆکانی ژێر زەوی وەدەریان نان و دووچاری لێدان و بریندار بوون بوونەوە، بەشێوەیەك کە وا

پێویستی کرد بگوازرێنەوە بۆ نەخۆشخانە، خراپتر لە هەموو ئەمانەش ئەوەبوو کە ئەو ڕۆژنامە فەرەنسیانەی کە زۆر بە توندی هێرشیان کردە سەر گارودیو کتێبەکەیو پارێزەرەکەی، هیچ وتارێکیان بڵاونەکردەوە کە لایەنگری گارودیان تێدا بووایە، تەنانەت ئەو وتارەش کە (باوکە بییر)[1] ناردی (ناوبراو خاوەن جەماوەرێکی زۆرە لە ناو فەرەنسادا، بە پلە یەك یەکێکە لەو کەسایەتییانەی کە لە هەموو فەرەنسادا زۆرترین جەماوەری هەیە)، ئەم پیاوە لە وتارەکەیدا کە بۆ ڕۆژنامەی (لۆمۆند)ی ناردو بڵاونەکرایەوە پشتگیری گارودی دەکات، بەمشێوەیە ڕۆژنامەکانی فەرەنسا جۆرە تێڕوانینێکیان لە لای ڕای گشتیی دروستکرد کە گارودی لە هەموو جیهاندا کەس پشتگیری لێناکات.

## سویسرا

هەرێمی "دی تۆر"ی سویسری ڕێگەی نەدا بە بڵاوبوونەوەی کتێبی "الأساطير المؤسسة للسياسة الأسرائيلة" دادگا ماوەی چوار مانگ زیندانی بەسەر ئەو بڵاوکارەدا سەپاند کە کتێبەکەی خستەڕوو.

## ئیتاليا

فیلمی ئەمریکی (الأغراء الأخير للمسيح) حەزرەتی مەسیح بە شێوەیەك وێنا دەکات کە ناڕەزایی زۆرینەی مەسیحییەکانی وروژاندو لە زۆربەی وڵاتە ئەوروپییەکاندا نمایشکردنی قەدەغە کرا، هەروەها دەرهێنەری فیلمەکەو بەڕێوەبەری فیستڤاڵی ڤینیسیای سینەمایی کە میوانداری فیلمەکەی لە فیستڤاڵەکەدا کرد بوو بە هۆی فیلمەکەوە لە ڕۆمای پایتەختی ئیتاليا درانە دادگا.

## کەنەدا

.. لە یاسای کەنەدیدا هەر جۆرە گوزارشت کردنێك کە ببێتە هۆی بەرپابوونی ڕقو کینە بۆ هەر گروپێکی ڕەگەزیی یان ئیتنیی یان ئایینیی قەدەغەیە، هەر چەندە دەستووری کەنەدی باس لەوە دەکات کە مافی هەموو هاوڵاتییەکە بە ئازادانە ڕای خۆی دەربڕێت، بەڵام دەستوور ڕێگە بە ئەنجومەنەکانی یاسادانانی کەنەدی دەدات کە سنور بۆ ئازادی ڕادەربڕینو هەر جۆرە ئازادییەکی دیکەی دەستووری دیاری بکات، گەر هاتوو ئەو کارە پێویست بوو، بە پشتبەستن بەم بەندە دەستووریەش دادگای باڵای کەنەدی بڕیاری سزایەکی پەسەند کرد، کە بە پێی ئەو بڕیارە یەکێك لە دادگاکانی هەرێمی "البرتا" حوکمی لە دژی بەڕێوەبەرێکی قوتابخانە دەرکرد کە بە دژایەتی کردنی "ڕەگەزی سامی"و پڕوپاگەندە کردن بۆ ڕق لێبوونەوەی یەهود تۆمەتبار کرا.

. بەیانی ڕۆژی (١٥/١٠/١٩٩٤) تۆڕی تەلەفزیۆنی (ctv) هەستا بە میوانداریکردنی "بێژەری سیاسی ئیسرائیلی" "جۆزیف لیبد"، ناوبراو ڕاستەوخۆ لە شاشەی تەلەفزیۆنەوە داوای لە یەهودییەکانی کەنەدا کرد کە یەکێکیان هەستێت بە کوشتنی "ڤیکتۆر ئۆسترۆ ڤۆسکی" (ئەفسەری مۆسادی ئیسرائیلی کە دوو کتێبی داناوەو تیایاندا پرۆسە نهێنییەکانی مۆساد ئاشکرا دەکات". ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە کارێکی وروژێنەری لەو جۆرە لە لایەن میدیای کەنەدییەوە بێدەنگییەکی تەواوی بەخۆیەوە بینی، بە پلەیەکی وا تەنانەت خودی ئەو نووسەرو بێژەرانەش کە بە جۆشو خرۆشێکی لە ڕادە بەدەر بەرگریان لە مافی سەلمان ڕوشدی دەکرد لە ئازادی ڕادەربڕیندا، بە تەنها یەك وشەش پشتگیرییان لەمافی ڕادەربڕینی "ئۆسترۆ فۆسکی" نەکرد!.

.. ساڵی (١٩٩٦) دادوەرێکی کەنەدی لە هەرێمی "کۆبیك" هەستا بە دەرکردنی فەرمانی زیندانیکردنی هەتا هەتایی ژنێك بە چەقۆ مێردەکەی خۆی سەربڕیبوو، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو حوکمە کە دەریکرد بوو دادوەرەکە وتی: "ئەوە سەلمێنرا کە ژن دەتوانێت زیاتر لە پیاو توندوتیژتر بێت، تەنانەت نازییەکانیش بەر لە کوشتنیان ئازارو ئەشکەنجەی قوربانیە یەهودیەکانیان نەداوە".

ئەم وتەیەی دادوەر گێژەڵوکەیەکی هاتو هاوارو ناڕەزایی دەربڕینی دژ بە دادوەرەکە لە لایەن ڕێکخراوەکانی ژنانو

[1] ـ الأب ـ باوك : نازناوو پلەیەکی باڵای پیاوانی کەنیسەیە.

یەهودیەکانی کەنەداوە لێکەوتەوە، بۆیە دادوەرەکە ناچار بوو پۆزش بهێنێتەوە، بەڵام ڕاشیگەیاند ئەو بڕوای بە هەموو وشەیەك هەیە کە لەو ڕوونکردنەوەیەدا سەبارەت بە حوکمەکە وتویەتی، ئەمەش شەپۆلی ناڕەزایی دەربڕینەکەی لە دژی زیاتر کردو چەندین دەنگ بەرزکرانەوە بۆ ئەوەی ئەو دادوەرە دەست لەکار بکێشێتەوە، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو، لەم کاتەدا ئەنجومەنی قەزایی کەنەدا هاتە ناو مەسەلەکەو هەستا بە لێکۆڵینەوە لەگەڵ دادوەرەکەدا، پاشان ئەنجومەنی پەرلەمانی کەنەدی داوای کرد دادوەرەکە بە هۆی ئەو ڕوونکردنەوەیەوە لەسەر کار لابرێت، کاتێك مەسەلەکە بەم ئاقارە گەیشت دادوەرەکە ناچار بوو بەرلەوەی لە لایەن پەرلەمانەوە لەسەر کار لابرێت خۆی دەست لە کار بکێشێتەوە، چونکە ئاشکرا بوو کە پەرلەمان داواکەی ئەنجومەنی قەزایی کەنەدا پەسەند دەکات بەوەە کە دادوەرەکە لەسەر کار لاببات.

## ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا

ـ کۆمەڵە فیلیمێکی دۆکۆمێنتاری کە ڕۆژنامەنووسی ناوداری بەریتانی "د. ڕۆبرت فیسك" هەستا بوو بە ئامادەکردنیان، نمایشکردنیان قەدەغە کرا، چونکە تووڕەیی گروپە سەهیۆنیەکانی ناو ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای ووروژاند، ئەم گروپە هەرەشەیان لە تۆڕی تەلەفزیۆنەکە کردبوو بەوەی کە هەموو ڕیکلامەکانی لەو تەلەفزیۆنەدا دەکێشێتەوە، ئەو هۆیەشی کە لەپشت تووڕەیی سەهیۆنییەکانەوە بوو ئەوە بوو ئەو کۆمەڵە فلیمە کە "ڕۆبرت فیسك" هەستابوو بە ئامادەکردنیان ناونیشانەکەی بریتیبوو لە "ڕەگو ڕیشەکانی تووڕەیی موسڵمانان" ئیسرائیلی بەوە تاوانبار دەکرد کە ئەو هۆکاری سەرەکی ناسۆرییەکانی موسڵمانانە لە ڕۆژئاوادا، شایانی باسە لێرەدا ئاماژە بەوە بکەین کە ڕۆبرت فیسك وەك باشترین ڕۆژنامەنووسی بەریتانی بە توانا لە ڕووی نمایشکردن و شیکردنەوەی هەواڵە سیاسییە نێودەوڵەتییەکان، لە ساڵی (١٩٩٥)دا خەڵاتی ڕۆژنامەگەری بەریتانیای پێبەخشرا.

. ساڵی (١٩٧٢) پاش بە چاپ گەیاندنی یەکێك لە کتێبەکانی زانای بەناوبانگی ئەمەریکی "نعوّم چۆمسکی" ئەو کۆمپانیایەی کە خاوەنی خانەی بڵاوکردنەوەی کتێبەکە بوو بە ناوەرۆکی کتێبەکەی زانی کە بە دڵی ئەندامانی ئەنجومەنی کارگێڕی کۆمپانیاکە نییە هەستا بە ڕاگرتنی دابەشکردنی کتێبەکە لە بازاڕەکانداو پاشان لەناو بردنیان، ئەوەشی کە ئاشکرایە تەلەفزیۆنە ئەمەریکییەکان زۆر بە کەمی زاتی ئەوە دەکەن کە میوانداری "چۆمسکی" بکەن، ئەو کەسەی کە هەندێك لە ڕۆژنامەکانی وەك ڕۆژنامەی "نیویورك تایمز" وەها وەسفی دەکەن کە دەتوانرێت لە ئێستادا "چومسکی" بە گرنگترین بیریاری جیهان لە قەڵەم بدرێت، زات نەکردنی میوانداری کردنیشی لە لایەن تەلەفزیۆنەکانەوە هۆی ئەوەیە کە ڕاو بۆچوونەکانی "چۆمسکی" هەمیشە سەرکردەو سیاسەتمەدارە ئەمەریکی و ئیسرائیلییەکان قەڵس دەکات.

. سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمەریکا "نیوت جینجریچ" هەستا بە دەرکردنی ژنە مێژوونووسێکی ئەندام لەو ئەنجومەنەدا کاتێك ئەوەی زانی کە ئەو ژنە مێژوونووسە پێشتر ڕایگەیاند بوو: "بیروبۆچوونی نازییەکان بە چاوپۆشی لەوەی کە جەماوەریشی نییە تا ئێستاش هەر بیروبۆچوونەو مافی گوزارشت کردنی پێنادرێت".

ـ ساڵی (١٩٨٦) "جۆرج جیلبیرت"ی نووسەر نەیتوانی بڵاوکارێکی (چاپخانە) دەست بکەوێت تاوەکو چاپی کتێبەکەی "ألأنتحار الجنسي" بۆ دووبارە بکاتەوە، بە مەرجێك ئەو کتێبانەی "جیلبرت" کە لە سەرەتاکانی ساڵەکانی هەشتاکاندا بڵاوبوونەوە فرۆشیان لەسەرو لیستی فرۆشراوە جیهانیەکانەوە بوو، هۆکاری ڕازی نەبوونی بڵاوکارەکانیش ئەو ناڕەزاییە توندە بوو کە ڕابەرانی بزوتنەوەی ئازادیخوازی ژنان لە دژی ناوبراو دەریان بڕیبوو، چونکە "جیاوازییەکانی پیاو لە ژن پێویست ناکات تەنانەت دیراسەش بکرێت". وەك یەکێك لەو ژنانە لە چاوپێکەوتنێکدا وتبووی و بەم دوایانە لە تۆڕی (ABC) ئەمەریکییەوە پەخش کرا.

. "ڤانسا ریدگریڤ"ی ژنە ئەکتەری بەناوبانگی بەریتانی ڕێگەی پێنەدرا لەو شانۆگەرییە کۆمیدییە بەریتانییەدا کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان نمایش دەکرا ڕۆڵەکەی خۆی ببینێت، ئەمەش بە هۆی ئەو ڕاگەیاندنانەی کە لە دژی

دەستتێوەردانی ئەمەریکا دژ بە عێراق لە جەنگی کەنداودا دەربڕیبوون.

جێی باسە ناوبراو زۆربەی جار کارە هونەریەکانی ڕوبەڕووی بایکۆت یان ڕەدکردنەوەی نمایشکردنیان لە ئەمەریکادا دەبنەوە، بە هۆی ئەو بیروڕا دژانەی کە بەرامبەر بە سەهیۆنیەت و سیاسەتەکانی ئیسرائیل هەیەتی.

## رووبەری ئازادی

کەواتە ئازادی ڕەهای رادەربڕین لە ڕۆژئاوادا خورافەیەکە بوونی نییە، چونکە مرۆڤ لە ڕۆژئاوادا لەوانەیە تەنها لەسەر دەربڕینی ڕایەکی خۆی کە بڕوای پێیەتی بۆ چەند ساڵێك زیندانی بکرێت، یان کەسێك بە هۆی ڕاگەیاندنی وتەیەکەوە کارەکەی لە دەستبدات، لەوانەشە نووسەرێکی ناسراو خانەیەکی بڵاوکردنەوەی دەست نەکەوێت کە کتێبێکی بۆ بڵاوبکاتەوە ئەگەر بیروڕاکانی ناو کتێبەکە لەگەڵ بیروباوەڕەکانی ناو کۆمەڵگەدا جیاواز بوو، ئەگەر بڵاوکاریشی دەست بکەوێت ئەو کتێبخانەیەی دەست ناکەوێت کتێبەکەی بخاتەڕوو، ئەگەر بڵاوکارو کتێبخانەشی دەست کەوت ئەوا لەوە ڕزگاری نابێت کە لە پێناو ناوەڕۆکی کتیبەکەدا دادگایی و زیندانی بکرێت، لەوانەشە لێکۆڵیارێکی ئەکادیمی ناسراویش بەهۆی دەربڕینی ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی بۆ ڕۆژنامەکان خۆی لە بەردەم دادگادا ببینێتەوە. لەوانەشە لەو پێناوەدا ئیدانەو غەرامەش بکرێت، ڕوودەدات کە سەرنووسەری ڕۆژنامەیەك بەهۆی بڵاوبوونەوەی وتارێك لە ڕۆژنامەکەیدا بدرێتە دادگا، یان خودی ڕۆژنامەکە بەهۆی تووڕە بوونی خودان ڕیکلامەکانەوە بکەوێتە بەر هەڕەشەی ئیفلاس بوون، لەوانەشە دەرگای ڕۆژنامەکە دابخرێت، ئەگەر هاتوو ئەو سنوورانەی تێپەڕاند کە لە سەریان ڕێککەوتوون.. هتد.

بێگومان لە هەموو ئەمانەش سەیرتر ئەوەیە کار بگاتە ڕادەیەك کە تەنانەت گفتوگۆکردنیش لە هەندێك مەسەلەدا قەدەغە بکرێت، سزای هەموو کەسێك بدرێت کە زاتی ئەوە بکات بپرسێتەوە، یان دەرگای گفتوگۆکردن والا بکات، کە ئەو تێڕوانینە بدات بە دەستەوە کە ڕۆژئاوا کەموکورتی تەنها لە بواری ئازادی رادەربڕیندا نییە، بەڵکو لە ڕووی بیرکردنەوەشەوە ناتەواوەو ئازادی ڕەهای تێدانییە!

ئەو ماوەیەی دراوەتە ئازادی ڕادەربڕین لە ڕۆژئاوادا ڕەهاو بێ سنوور نییە، هەرچەندە زمانی باو لە گوتاری سیاسی ڕۆژئاوادا لەوانەیە پێچەوانەی ئەو ڕاستییە بخاتە ڕوو، مومارەسە ڕۆژئاواییەکان هەرگیز نەگەیشتونەتە ئاستی ئەو دروشمە ڕۆژئاواییانەی دەربارەی پاراستنی مافی ڕادەربڕین بۆ هەمووان بەرزکراونەتەوە، حکومەت و کۆمەڵگە ڕۆژئاوایەکان هەرگیز بەو چاوەوە نەیانڕوانیوەتە ئازادی ڕا دەربڕین کە بە کارێکی پیرۆزی سەیر بکەن و نەتوانرێت لێی نزیك بکەوێتەوە، یاخود لە جێو شوێنی کەم بکرێتەوە، بۆیە دەبینین زۆرێك لە حکومەتە ڕۆژئاواییەکان هەندێك بیروڕا دەخەنە دەرەوەی پاراستنی یاساوە، یان لەوانەیە ئەنجومەنەکانی یاسادانانی ڕۆژئاوا چەند یاسایەك دەربکەن کە تیایدا هەندێك بیرو ڕا بە تاوانی لە قەڵەم بدات و گفتوگۆکردنی هەندێکی دیکەش یاساغ بکات و سزای هەموو ئەو کەسانەش بدات بە پێچەوانەی ئەوەوە بجوڵێنەوە، ئەوەش بە غەرامە کردن، یان زیندانی کردن کە لەوانەیە بگاتە چەند ساڵێك. ئەو هۆکارانەش کەوا لە حکومەتە ڕۆژئاواییەکان دەکات بۆ پێشێلکردنی ئازادی ڕادەربڕین زۆرن، چونکە لەوانەیە زۆرینەی کۆمەڵگە دژی ئەوە بن بە ئاشکرا ڕێگە بدرێت بە گوزارشت کردن لە هەندێ بیروڕا، لەبەرئەوە حکومەتیش وەڵامی ڕای گشتیی دەداتەوە، زۆرجار قەدەغەکردنی بیروڕاکان وەڵامدانەوەیەکە بۆ حەزی کەرتێکی گرنگ لە دەنگدەران، یان دەست ڕۆیشتوەکان، یان ئەوانەی خەرجی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن لە ئەستۆ دەگرن، یاخود کەمینەیەکی کاریگەرە لە ناو دەوڵەتدا، ئەمەش وا دەکات حکومەت ناچار بێت ملکەچی داواکاریەکانیان بێت، زۆر جاریش حکومەتەکان پەنا دەبەنە بەر سزادانی هەندێك بیروڕا بە مەبەستی پاراستنی ژیانی ئاشتیانەی کۆمەڵگەو ئاسایشی نەتەوەیی و.. هتد. جا هەرچەندێك هۆکارەکانی بەرتەسککردنەوەی ئازادی ڕادەربڕین زۆربن، بەڵام ئاکامەکەی یەك شتە، ئەویش ئەوەیە کە ئازادی رادەربڕین لە ڕۆژئاوادا ئەو پیرۆزییەی کە زۆرێك لە ناوەوەو دەرەوەی ڕۆژئاوادا واگومانی پێدەبەن.

خورافەیەکی دیکەش کە لە مەیدانی حەقیقەتدا بوونی نییە ئەوەیە گوایە ڕۆژنامەو دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا ئازادی ڕەهایان هەیە لەوەی کە دەینووسن، یان بە ئارەزووی خۆیان بڵاوی دەکەنەوە، ئەمەش لەبەرئەوەیە ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوایی هەرچەندە سەربەخۆییەکی فراوانی هەیە لە دەسەڵاتی سیاسی و توانایەکی زۆری هەیە لە لێپرسینەوەو ڕەخنەگرتن و ئاڕاستەکردنی حکومەتەکان، بەڵام لە ناو کۆمەڵگەدا هەمان ئەو سەربەخۆییەی نییە لە سەرمایەو سەنتەرەکانی سەروەت و سامان و پشت و پەنای جەماوەریی، چونکە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا زۆربەیان دامەزراوەی تایبەتن و بە دووی قازانج و زیادکردنی بڵاوبوونەوەو ڕاکێشانی خاوەن ڕیکلام و پروپاگەندەکاندا دەگەڕێن، ئەمەش وا دەکات ئازادییەکەی سنووردارو جوڵانەوەشی کۆت و بەند بکرێت، لەبەرئەوە ڕۆژنامە گەورەکان و دەزگا ڕاگەیاندنە کاریگەرەکان ناتوانن ئەو ڕایانە بخەنەڕوو کە دەبنە مایەی ورووژاندنی تووڕەیی کەرتە فراوان و کاریگەرەکانی جەماوەر، ئەگەر نا خوێنەرەکانیان لەدەستدەدەن، هەروەك چۆن ناتوانن ئاماژە بەو بابەتانە بکەن کە کار دەکەنە سەر هەستی ساماندارو ئەوانەی خەرجی ڕیکلامەکان لە ئەستۆ دەگرن، چونکە قازانجەکانیان دەدۆڕێنن.. هتد، زیاد لەوەش خودی دەزگاکانی ڕاگەیاندن موڵکی ژمارەیەکی کەمی پیاوە دەوڵەمەندە گەورەکان و پاشانیش ملکەچی بۆچوونە تایبەتی و حەزە سیاسییەکانیانن.

لەبەرئەوە "جۆرج ئۆرویل"ی گەورە نووسەری بەریتانی لە وتارێکی بەهاداریدا بە ناونیشانی "ئازادی ڕۆژنامەگەریی" بەشێوەیەکی ڕەوانبێژانە بارودۆخی ڕۆژنامەگەریی ڕۆژئاوای کورت کردۆتەوەو دەڵێت: "ئەو ڕایانەی کە جەماوەریان نییەو ئەو ڕاستییانە کە هەندێك حەزیان لە بیستنیان نییە، بەبێ پێویست بوونی هیچ بڕیارێکی فەرمیی کە گوزارشت لێکردنیان قەدەغە بکات بێدەنگ دەکرێن، ڕۆژنامەگەریی لە ناوەندەوە کۆنترۆڵ کراوە. بەشێوەیەك زۆربەی ڕۆژنامەکان موڵکی ژمارەیەکی کەم لەو سەرمایەدارانەن کە هۆکاری بەهێزیان بە دەستەوەیە تاوەکو جێگەی متمانە بن لە کاتی گوزارشتکردن لە هەندێك بابەتی گرنگ، هەر ئەو دەزگا چاودێرییە نهێنییانەی کە ڕۆژنامەگەریی بەکاریان دێنێت بەهەمان شێوە لەگەڵ کتێب و گۆڤارە وەرزی و فیلم و ڕادیۆکانیشدا بەکار دەهێنرێت.. لە هەموو سەردەم و کاتێکدا کۆمەڵێك بیروڕا هەن کە پێویست بەوە دەکەن خاوەن "عەقڵە تەندروستەکان" بە بێ چەندو چوون وەریان بگرن.. هەر مرۆڤێك هەوڵی ئەوە بدات گژانێ (تحدی)ی ئەو ڕا پەسەندانە بکات بەشێوەیەك خۆی بەلاڵ کراوی دەبینێتەوە کە مایەی سەرسوڕمانە، هەر ڕایەك لە سەر مۆدە نەبێت هیچ کەسێکی دەست ناکەوێت بە ویژدانەوە گوێی لێبگرێت".

سەرەڕای هەموو ئەوەی کە باسکرا نابێت وا تێبگەین کە ئازادی ڕادەربڕین و ئازادی بیرکردنەوە لە ڕۆژئاوادا بوونی نییە، هەر دەرەنجامێکی لەو شێوەیە واقیعی نییەو بێویژدانیشە، لە ڕاستیدا ئەمڕۆ ڕۆژئاوا زیاتر لە هەر شوێنێکی دیکەی جیهان بەشێك لە ئازادی ڕا دەربڕین و ئازادی بیرکردنەوەی تێدا هەیە، جا مرۆڤ ناتوانێت بەو ئازادییە نەزانێت کە بۆ ناڕەزایی دەربڕین و خۆپیشاندان و مانگرتن هەیەو دەستوورەکانی ڕۆژئاوا پشتگیری لێدەکەن، ڕاستیش نییە مرۆڤ خۆی گێل بکات لەو ئازادییەی کە بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە هەموو شوێنێکی ڕۆژئاوادا دەستەبەر کراوە بۆ گفتوگۆکانی ناو پەرلەمان و هۆڵەکانی وانەبێژی، ناکرێت لە ڕۆڵی ڕۆژنامەگەری ڕۆژئاوا کەم بکەینەوە لە ئاشکرا کردنی سنوور بەزاندنەکانی سیاسەتمەدارەکان و خراپی هەڵسوکەوتیان، ڕاستیش نییە بۆ نموونە ڕۆڵی ڕۆژنامەی (واشنتۆن پۆست) لەبیر بکەین لە ئاشکرا کردنی ئابڕووچوونەکەی "واتەرگێت"داو.. هتد.

بەڵام حەقیقەتێك کە دەمێنێتەوە ئەوەیە ئازادی ڕادەربڕین لە ڕۆژئاوادا ناتەواوەو لە ئاستی ئەو دروشمە بریقەدارانەدا نییە کە زۆرێك لە دەستوورەکانی ڕۆژئاوا بەرزیان دەکەنەوەو ڕێککەوتنامەکانی مافی مرۆڤ بانگەشەی بۆ دەکەن، لەوانەشە یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی ئەوە بگەڕێتەوە بۆ کەموکورتی خودی نموونە دیموکراسییە سەرمایەدارییەکەی ڕۆژئاوا، کەپارەو پول تێیدا ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوە دەگێڕێت لە یارمەتیدانی دارایی حیزبە سیاسییەکان و هەڵمەتەکانی پروپاگەندەی هەڵبژاردن و کۆنترۆڵکردنی دەزگاکانی ڕاگەیاندندا.

ئەمەش ڕۆڵێکی سیاسی گەورە دەبەخشێتە سەرمایەدارەکان و گروپە ڕێکخراوەکانی فشار، زیاتر لەوەی کە ڕێژە

ژمارەییەکەیان (واتە کەم و زۆرییان - وەرگێڕ) لە ناو کۆمەڵگەدا ڕێگەیان پێدەدات، لە پاشانیشدا بێدەنگکردنی ئەو بیروڕایانە ئاسان دەکات کە دەبنە مایەی بێزارکردنی ئەم گروپە سیاسییە کاریگەرانە، ئەمەش یان بە شەرعاندن و یاساکان یان لە ڕێگەی بوار نەدان بەو ڕایانە تاوەکو لە دەزگاکانی ڕاگەیاندندا گوزارشت لە خۆیان بکەن، ئەم کەموکورتییەش لە سیستمی سیاسی ڕۆژئاوادا هۆکارێکی سەرەکی بووە لە پشت سەرکەوتنی گروپە یەهودییەکان و ڕێکخراوە سەهیۆنییەکان لە وڵاتە جیاجیاکانی ڕۆژئاوادا بۆ بەکارهێنانی ئەو دەسەڵاتە سیاسی و ئیعلامییە زۆرەی کە هەیانە بۆ کپکردنەوەی ئەو دەنگانەی دژ بە یەهودن یاخود نەیاری ئیسرائیلن، بەڵام لۆمەکردنی دیاردەکانی هەڵەو کەموکورتی لە نموونە ڕۆژئاواییەکەدا بە تەنها بەس نییە بۆ ڕاڤەکردنی ئەو کۆت و پرەنسیپە جیاوازانەی لە سەر ئازادی ڕا دەربڕین لە ڕۆژئاوادا دانراون، لەوانەشە کرۆکی گرفتەکە لە خودی بنەمای ئازادی ڕادەربڕینەکە خۆیدا بێت، لەبەرئەوە حەقیقەتی مەسەلەکە ئەوەیە کە ئازادی ڕادەربڕین وەك هەموو ئازادییە مرۆییەکانی دیکە ناکرێت ڕەهاو بێسنوورو بێ پرەنسیپ بێت، چونکە ئازادی بە بێ بوونی بەرپرسیارییەتیەك کە ڕۆچوونەکانی دیاری بکات بوونی نییە، ئازادی ڕادەربڕین بەبێ بوونی بەرپرسیارێتی لەوانەیە ببێتە مایەی ئەوەی کە ئاکامی خراپی لێبکەوێتەوە، چ بۆ تاکەکان و چ بۆ کۆمەڵگەکانیش، هەر کۆمەڵگەیەکی مرۆیی هەر چەندێك پلەکانی دیموکراسییەتی سیاسی و لیبراڵیەتی فیکری بڕێت ناچارە لە پێناوی بەرژەوەندی باڵای کۆمەڵگەدا کۆت و بەند لەسەر ئازادی ڕادەربڕین دابنێت، ئەمەش بە تەواوەتی ئەو شتەیە کە لە زۆربەی کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکاندا ڕوویداوە، بۆ نموونە وڵاتێکی وەك ئەڵمانیا ناچار نەبوو بە تاوان ناساندنی هەموو کتێب و وتارو شێوازەکانی پڕوپاگەندەی نازییەت تا ئەو کاتەی کە ترسی نازییە تازەکان لە ئەڵمانیادا سەریهەڵدا، بە ڕادەیەك ئەوانە لە نێوان ساڵەکانی (١٩٨٩- ١٩٩٥)دا هەستان بە ئەنجامدانی زیاتر لە سی هەزار دەستدرێژیکردنی جەستەیی بۆ سەر تاکە کەمینەکانی ناو ئەڵمانیاو ئاگر بەردانە ماڵەکانیان و زیاتر لە سی تاوانی کوشتنیان ئەنجامدا، لەبەرئەوە زۆرینەی گەلی ئەڵمانیا زۆر بە توندی پشتگیری لەو ڕێوشوێنە سەرکوتکارانە دەکەن کە حکومەتی ئەڵمانیا لە بەرامبەر مافی ئازادی ڕادەربڕیندا مومارەسەیان دەکات، بە هیوای گەمارۆدانی چالاکییەکانی ئەو نازییە نوێیانەو ڕێگە لێگرتنیان لە ڕاکێشانی لایەنگری زیاترو ئەنجامدانی تاوانی زۆرتر، تەنانەت یاسای ڤابیۆس - جیسۆی فەرەنسی سەرەڕای ئەو هەموو ڕەخنە مەشروعانەی لە لایەن ڕۆشنبیرە عەرەبەکانەوە لە دژی ئاراستەکران، بەڵام نابێت ئەوەمان لە یاد بچێت ئەو یاسایە لە پەرلەمانی فەرەنسادا ساڵی (١٩٩٠) بڕیاری لەسەر درا - نەك پێش ئەوە - بە هۆی زیادبوونی ڕووداوەکانی دەستدرێژیکردنە سەر گۆڕستانەکانی یەهود بوو لە فەرەنسادا، بۆیە پەرلەمانی فەرەنسی ناچار بوو یاسایەکی ڕادیکاڵی لەو شێوەیە پیادە بکات، وەك دیاردەیەك لە دیاردەکانی هاوکاری پەرلەمان لەگەڵ یەهودییە فەرەنسییەکان و دژ بە دەستدرێژییە زۆربووەکانی ڕاستڕەوە توندڕەوەکان، هەر بە هەمان لۆژیك یاساکانی پاراستنی کەمینەکان لە زۆر دەوڵەتی وەك ئوسترالیاو کەنەداو دانیمارك ئامانجیان دانانی سنوورێکە بۆ ئەو زوڵم و ستەمانەی لە ڕابردوودا ڕووبەڕووی کەمینەکانی ئەو وڵاتانە بووەتەوەو بووەتە هۆی بڵاوبوونەوەی ڕەگەزپەرستی و دەمارگیری، تەنانەت ئەنجامدانی تاوانیش دژ بە ڕۆڵەکانی ئەو کەمینانە.

لە ڕاستیدا ئازادی ڕەها بۆ هەموو جۆرەکانی دەربڕین مانای وایە ئازادییەکی ڕەها بۆ ڕق هەژاندن و نووسینی دوژمنکارانەو دەستەواژەی بریندارکەرو ئازاراوی، کە بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی دوژمنایەتی و ڕق و قین، تەنانەت تاوانکردنیش لە ناو کۆمەڵگەدا، بێگومان هەندێك جۆری دەربڕینی مرۆیی زیانی لە سوودی زیاترەو خراپەکارییەکانیشی لە چاکسازییەکانی زۆرترەو پێویست ناکات ئەو جۆرە دەربڕینانە بە هەمان شێوەی دەربڕینی سیاسی و فیکری و ڕۆشنبیری ڕێزیان بۆ دابنرێت.

بۆ نموونە کێ هەیە بەوە ڕازی بێت تانەو تەشەر لە ناوی بدرێت، یان بوختان بۆ شەرەف و کەرامەتی بکرێت؟ ئایا پێویستە کۆمەڵگە ڕێز بۆ مافی ئازادی ڕادەربڕینی بوختانچی دابنێت، یان مافی بوختان بۆ کراوە کە ڕێگە نەدرێت بە هۆی دەربڕینەوە ئازار بدرێت؟ ئەگەر هات و گروپێکی ڕەگەزیی بە تەواوی و بە شێوەیەکی ناشیرین ئاماژەی بۆ کراو بە

قێزەونی لەسەری نووسرا، ئایا پێویست بەوە دەکات کۆمەڵگە لە ئازادی رادەربڕیندا ڕێز بۆ ڕای ئەو تانەو تەشەر چییانە دابنێت، یان مافی تەشەر لێدراوەکانە کە ڕێز لە هەستیان بگیرێت‌و بە ئاشتی‌و ئارامی لە وڵاتەکانی خۆیاندا بژین؟ لە ڕاستیدا کۆمەڵگە مرۆییەکان زۆریان دەستدەکەوێت‌و کەمیان لە دەستدەچێت. لە کۆتدانان بۆ ئەو گوزارشتکردنانەی کە دەبنە مایەی بڵاوبوونەوەی ڕق‌و کینەو تووڕەیی لە نێوان ڕۆڵەکانی یەك کۆمەڵگەدا، هەموو کۆمەڵگەیەکی مرۆیش بەشێوەیەك لە شێوەکان پەیڕەوی دانانی هەندێ کۆت‌و بەندی بۆ هەندێك گوزارشت کردن کردووە، بە واتایەکی دیکە هەموو کۆمەڵگە مرۆییەکان بەهایەکی بەرزیان بەخشیوەتە مافی مرۆڤ لە ئازارنەدانی بە هۆی گوزارشتکردنەکانی کەسانی دیکەوە کە لەسەروی ئەو مافەوە بێت مرۆڤ بە هۆی گوزارشتکردنی ئازادەوە خراپە بەرامبەر بە کەسانی دیکە بکات.

لە ڕاستیشدا تاکە هەوڵێك کە درابێت بۆ زیادکردنی جۆرێك لە پیرۆزی بۆ سەر مافی مرۆڤەکان لە گوزارشتکردنی ئازادانەداو بەخشینی بەهایەك بەو مافە کە لە هەموو مافەکانی دیکە گەورەتر بێت بریتییە لە هەوڵی دەستووریی ئەمریکی کە لە لایەن دامەزرێنەرە یەکەمەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە دانراوەو ویستوویانە حکومەت‌و ئەنجومەنی یاسادانان لە هەر توانایەك دابماڵن کە دەست بۆ ئازادی رادەربڕین ببات، بەڵام ئایا ئەو ئەزموونە سەرکەوتنی بەدەستهێنا؟ یان هەر بە ڕاستی توانی پارێزگاریکردنی ڕەها ببەخشێتە ئەو ئازادی گوزارشتکردنەی کە دەستوور داوای دەکات؟ لە ڕاستیدا ئەو نموونە ئەمەریکییە بۆ پاراستنی مافی مرۆڤ لە گوزارشت کردنی ئازادانەدا شیاوی ئەوەیە هەندێك درێژەی پێبدرێت‌و بە لەسەرخۆییەوە لێی بڕوانرێت.

## نموونەی ئەمەریکی

"کۆنگرێسی ئەمەریکی هیچ یاسایەك دەرناکات کە کۆت‌و بەندی ئازادی رادەربڕین یان ئازادی ڕۆژنامەگەری بکات".

بەمشێوەیە دەقی هەموارکراوی یەکەم دەستووری ئەمەریکی‌و یەکەم برگە لە "ڕێککەوتننامەی مافەکان" لە ساڵی (١٧٩١)داو بە زمانێکی ئاشکراو یەکلاکەرەوە بڕیاری لەسەر درا، ئامانجەکەشی ڕێگرتن بوو لە حکومەتی ئەمەریکی تاوەکو دەست بۆ ئازادی رادەربڕین نەبات، ئەمەش لە ڕێگەی ڕیزبەندکردنی ئازادی رادەربڕین شانبەشانی ئازادییەکانی ترو دانانی لەو شوێنەدا کە لە سەروو یاساوە بێت، بەشێوەیەك هەر بڕیاردانێکی یاسایی کە سنوور بۆ توانای هاوڵاتی ئەمەریکی دابنێت لە دەربڕینی ئازادانەدا بە پێشێلکردنی دەستوور بێتە ئەژماردن، پاشان دادگای باڵا کە (بڕیارەکانی بە ڕای زۆرینەی هەر نۆ قازییەکە دەردەچێت) دەتوانێت ئەو یاسایە هەڵوەشێنێتەوە، بەڵام ئایا هەر بە ڕاستی دادگای باڵای ئەمەریکی بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ ئازادی رادەربڕیندا کرد کە ڕەهایەو لەسەرو یاساوەیە؟ ئەم مەسەلەیەش پێویست بە پێداچوونەوەی بڕیارەکانی دادگای باڵا دەکات لە ڕۆژی دانانی دەستوورەوە هەتا ئێستا.

بە درێژایی دوو سەدە کە تەمەنی ئەو دادگایە دەکات تەنها دوو دادوەریان پێیان وابووە کە ئازادی رادەربڕین ڕەهایەو ناکرێت دەستی تێوەردرێت‌و کۆت‌و بەندی بۆ دیاری بکرێت، هۆکارەکان هەرچییەك بن‌و باروددۆخەکەشی هەرچۆنێك بێت، ئەو دوو دادوەرەش "هیگۆ بیلاك"و "ویلیام دۆگلاس" بوون، ئیتر جگە لەو دوو دادوەرە هەموو دادوەرەکانی دیکەی دادگای باڵا بە درێژایی مێژووی دادگاکە بەشێوەیەك مامەڵەیان لەگەڵ ئازادی رادەربڕیندا کردووە کە ئازادییەکی ڕێژەییەو ئەگەر پێویست کرا زۆرجار دەکرێت کۆت‌و بەندی لەسەر دابنرێت، ئەمەش جگە لە جیاوازی دادوەرەکان لە نێوان خۆیاندا سەبارەت بە چۆنیەتی مەزەندە کردنی پێویستی‌و ڕێگەی دیاریکردنی سوودو زیانەکانی تایبەت بە هەر حاڵەتێك. ئەمەی خوارەوەش خستنە ڕووی کورتەیەکە بۆ گرنگترین بڕیارەکانی دادگای باڵا لە مەسەلە پەیوەستەکان بە ئازادی رادەربڕین بۆ ئەوەی تیشکێك بخرێتە سەر فەلسەفەی دادگای باڵا لە مامەڵە کردن لەگەڵ ئەو جۆرە مەسەلانەدا:

ـ ١٩١٩: هاولاَتییەکی ئەمەریکی ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە ئەمەریکا بەشداری لە جەنگی جیهانی یەکەمدا بکات، داوا لە لاوان دەکات بەشداری لە خزمەتی سەربازیدا نەکەن، ئەگەر پێویستیشی کرد بەرگری دەسەلاَتدارانیش بکەن. ئەم هاولاَتییە درایە دادگاو بەرگردیکردنەکەشی پشتی بە ئازادی خۆی لە گوزارشتکردندا بەستبوو کە دەستوور پێیدەبەخشێت.

مەسەلەکە دەگاتە دادگای بالاَ ئەویش بڕیار دەدات هەر جۆرە گوزارشتکردنێك ئەگەر کاری پێکراو مەترسییەکی ئاشکراو خێرای لێکەوتەوە بەو گوزارشتکردنە لە قەلَەم نادرێت کە شیاوی پاراستنی دەستووریی بێت.

ـ ١٩٥٧: دادگای بالاَ بڕیاری بنەمای شیمانەی قەدەغەکردنی هەر جۆرە فیلم یان کتێب یان وتارێکی دا بە هۆی بێ ئابڕوویی سێکسی ناوەڕۆکەکەیەوە، بەلاَم بە مەرجێك هەر کارێك بۆ ئەوەی بەبێ ئابڕوویی یان ناشیرین یان خراپ لە قەلَەم بدرێت دەبێت ئامانجەکەی تەنها وروژاندنی حەزە سێکسییەکان بێت و هەلَسەنگاندنی ئەوەش لە سەر بنەمای ئاستی گشتیی بێت بۆ ڕەوشتەکان لە ناو کۆمەلَگەدا، بە واتایەکی تر مەسەلەکە بەو شێوەیەی لێنەکرێت کە بدرێتە دەست گرووپێك بە تەنها تا ئەو بڕیار لەسەر ئەوە بدات چی ناشیرینەو چیش جوان و شیاوە بۆ کۆمەلَگە.

ـ ١٩٦٤: ئەفسەرێکی پۆلیس لە ویلایەتی (ئەلاباما) دادگایی ڕۆژنامەی (نیویۆرك تایمز) دەکات بە هۆی ئەوەی ڕۆژنامەکە چەند تۆمەتێکی دژی ئەفسەرەکە بلاَوکردۆتەوە بەوەی کە هەستاوە بە چەند کارێکی توندوتیژی و سەرکوتکارانە دژ بە هاولاَتییە ڕەش پێستە چالاکەکانی بواری داواکردنی مافە مەدەنییەکانی ڕەش پێستەکانی ناو ئەو ویلایەتە، ئەفسەرەکە داوای قەرەبووکردنەوەیەکی دارایی گەورەی لە ڕۆژنامەکە کرد. مەسەلەکە دەگاتە دادگای بالاَ و دادگاش بڕیاری ئەوە دەدات هەرچەندە ئەوەی کە ڕۆژنامەکە بلاَویکردۆتەوە هەمووی ڕاست و دروست نەبووە، بەلاَم ئازادی ڕۆژنامەگەریی ئەوە پێویست دەکات کە ڕۆژنامە لەسەر بابەتێك سزا نەدرێت کە دژ بە لێپرسراوێکی دەولَەت بلاَوی دەکاتەوە، تەنها لە کاتێکدا نەبێت ئەگەر ئەو ڕۆژنامەیە بە ئەنقەست، خراپەو زیان بەو بەرپرسە بگەیەنێت لە ڕێگەی بلاَوکردنەوەی درۆ و دەلەسەیەکەوە کە ڕۆژنامەکە پێشتر ئەوەی زانیبێت کە ئەو شتانە درۆن یان کەمتەرخەمی بکات لەگەڕان بە دووی ئاشکرا کردنی ڕاستییەکاندا، بەلاَم ئەگەر چاك و خراپ تێکەلَ بە یەکتر بوون لەوەی کە ڕۆژنامەکە بلاَوی دەکاتەوە وەك هەولَدانێك بۆ خستنە پێش چاوی ڕاستییەکان بۆ بەردەم ڕای گشتیی، ئەوە پێویست ناکات هیچ ڕۆژنامەیەکی لەسەر سزا بدرێت، ئەگەرنا ڕۆژنامەکان چیتر ڕەخنە لە سەر بەرپرسەکان بلاَوناکەنەوە، بەمشێوەیەش هەموو کۆمەلَگە ڕۆلَی چاودێری کردنی ڕۆژنامەگەری لە دەستدەدات، لەبەرئەوە دادگاکە ئەم بنەمایەی لە وردەکاری بڕیارەکەدا بەم شێوەیە کورت کردەوە دەلَێت: "ڕۆژنامەگەری ئازادو بەهێز پێویستی بەوە هەیە بجولَێت بەبێ ترس لە دادگایی کردنەکان و خەرجییە قەزاییە قورس و گرانەکان لە هەر جارێکدا کە هەلَەیەك لەلایەن ڕۆژنامەیەکەوە ڕوودەدات".

ـ ١٩٦٤: دادگای بالاَ بڕیار دەدات بۆ ئەوەی بتوانرێت چ جۆرە گوزارشتکردنێك بە بێ ئابڕوویی سێکسی دابنرێت تا دواجار بتوانرێت قەدەغە بکرێت دەبێت ئەو گوزارشتکردنە لە وێنەی کتێبێکدا یان فیلمێك یان هەر شتێکی تردا بێت، بەبێئەوەی هیچ بەهاو سوودێکی هەبێت بۆ کۆمەلَگە، یان بە واتایەکی تر ناتوانرێت هیچ گوزارشتکردنێك قەدەغە بکرێت، مەگەر تەنها ئەو گوزارشتکردنە نەبێت کە هیچ جۆرە بەهاو نرخێکی نەبێت بۆ کۆمەلَگە.

ـ ١٩٧١: بەرپرسێکی گەورە لە وەزارەتی بەرگری هەلَدەستێت بە دزە پێکردنی چەند بەلَگەنامەیەك سەبارەت بە جەنگی ڤێتنام بۆ هەر دوو ڕۆژنامەی (نیویۆرك تایمز) و (واشنتۆن پۆست)، حکومەتی ئەمەریکی هەولَدەدات ڕێگە نەدات بە بلاَوبوونەوەی ئەو بەلَگەنامانە، چونکە ئەوانە لە نهێنییە بالاَکانی دەولَەتن، دادگای بالاَ بڕیار دەدات ئەو دوو ڕۆژنامەیە دەتوانن بەلَگەنامەکان بلاَوبکەنەوە، چونکە بەلَگەنامەکان سەرەڕای ئەوەی پەردە لە ڕووی مومارەسە کردنەکانی ئەمەریکا لە ڤێتنامدا هەلَدەمالَێت و سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا ڕووبەڕووی شەرمەزارییەکی زۆر دەکاتەوە، چونکە ناوەڕۆکی بەلَگەنامەکان پێچەوانەی سیاسەتی ئاشکرا کراوی ئەمەریکایە، بەلاَم هیچ شتێك لەو بەلَگەنامانەدا نییە کە زیان بە ئاسایشی نەتەوەیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بگەیەنێت، یاخود هێزی چەکداری ئەو ولاَتە

ڕووبەڕووی مەترسی بکاتەوە، حکومەت بۆ ئەوەی بتوانێت قەناعەت بە دادگا بکات لە گرنگی قەدەغە کردنی بڵاوکردنەوەی ئەو بەڵگەنامانە پێویستە لە سەری بەڵگەی بەهێزو یەکلاکەرەوە پێشکەش بە دادگا بکات، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە بڵاوبوونەوەی ئەو بەڵگەنامانە زیان بە ئاسایشی نەتەوەیی ئەمەریکی دەگەیەنێت.

ـ ١٩٧٣: دادگای باڵا بڕیاری دا هەڵسەنگاندنی هەر فیلمێك یان کتێبێك بۆ ئەوەی بزانرێت خراپە یان لە ڕووی سێکسییەوە بێ ئابڕوانەیە دەبێت لە ڕێگەی ئاستی ئەخلاقی گشتیو نەریتە باوەکانی ویلایەتەکانو ناوچە جیاجیاکانەوە بکرێت، نەك نەریتە باوەکان لە سەر ئاستی گشتیی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەم شێوەیەش دادگای باڵا ڕێگە بە حکومەتە ناوچەییەکان نەگونجێت هەروەها دادگا ئەو بڕیارەی خۆی گۆڕی کە پێشترو لە ساڵی (١٩٦٤)دا دەری کرد بوو کە تیایدا هاتبوو: "ناکرێت گوزارشتێك قەدەغە بکرێت بەوەی کە ناشیرینو ئابڕو بەرانەیە تەنها لە کاتێکدا نەبێت کە ئەو گوزارشتکردنە بەهیچ شێوەیەك بەهایەکی کۆمەڵایەتی نەبێت، تا ئەو شوێنەی کە گوزارشتکردنی نەشیاوو قێزەون دەتوانرێت قەدەغە بکرێت ئەگەر هاتوو بەها ئەدەبیو هونەریو سیاسییو زانستیەکەی دیاریکراو یان بێ ماناو هیچ بێت".

ـ ١٩٧٤: دادگای باڵا بڕیار دەدات کە هاوڵاتی ئاسایی مافێکی گەورەی هەیە بۆ پاراستنی لە بوختانو سوکایەتی پێکردن زیاتر لە بەرپرسێکی گشتیی، چونکە ڕەخنەگرتن لە هاوڵاتی ئاسایی لە ڕۆژنامەکاندا هەمان ئەو سوودی ڕەخنە گرتنەی نییە کە لە بەرپرسەکان دەگیرێت.

ـ ١٩٧٨: وێستگەی پەخشی ڕادیۆیی لە نیویۆرك بەرنامەیەکی پەخشکرد کە زاراوەی ناشیرینی تێدا بەکارهاتبوو، یەکێك لە گوێگرەکانی ڕادیۆکە شکات لە دەست ئەو زمانە بازاڕییە دەکات کە بەبێ مۆڵەت خۆی دەکات بەناو ماڵی خەڵکیدا، دەستەی پەیوەندییە فیدراڵیەکانی ئەمەریکا هەوڵدەدات کۆتو بەند لەسەر ئەو زمانە بەکارهاتووە دابنێت کە لە ڕادیۆکانەوە پەخش دەکرێت، مەسەلەکە دەخرێتە بەردەم دادگای باڵا کە دواجار ئەویش بڕیار دەدات کە دەتوانرێت کۆتو بەند لەسەر زمانی بەکارهاتووی پەخشە ڕادیۆییو تەلەفزیۆنییەکان دابنرێت، ئەم بڕیارە وایکرد دەستەی پەیوەندییە فیدراڵیەکان بتوانێت سزای وێستگەیەکی پەخشی تەلەفزیۆنیی بدات، چونکە لەو تەلەفزیۆنەوە فیلمێکی پەخش کرد بوو کە تیایدا ئافرەتێك بە سنگی ڕووتەوە تیایدا دەرکەوتبوو، هەندێ وێستگەی ڕادیۆش سزادران بە غەرامەکردنێکی دارایی لەبەرئەوەی گۆرانی نەشیاویان پەخش کردبوو.

ـ ١٩٩٢: دادگا بڕیاریدا بە نادەستووریی بوونی ئەو یاسایەی کە شاری (سانت پول) دەری کردبوو کە تیایدا هەر گوزارشتکردنێك قەدەغە دەکات کە ببێتە مایەی وروژاندنی تووڕەیی یان ڕقو کینە دژ بە کەمینەکان.

لە ڕاستیدا زۆربەی هەرە زۆری دادوەرەکانی دادگای باڵا بەشێوەیەك مامەڵەیان لەگەڵ ئازادی ڕادەربڕیندا کردووە کە بە مافێکی ڕەهایان نەزانیوە، دەوڵەت بۆی هەیە لە بەرامبەر خراپ بەکارهێنانی ئەو ئازادییەدا سزا بدات، پاراستنی دەستووریی ناکرێت بەکاربهێنرێت بۆ پاراستنی چەند جۆرە گوزارشتکردنیکی وەك بوختانو سوکایەتی پێکردنو درۆکردن لە کاتی شایەتی دانداو پڕوپاگەندەی بازرگانی فریودەرو هاندان بۆ ئەنجامدانی تاوانو گوزارشتە سێکسییە شەرم ئامێزەکانو چەند جۆرێکی تر لەو چەشنە گوزارشتانەی کە زیانیان هەیەو سوودیان نییە.

ئەزموونی ئەمەریکی بە ڕوونی ئەوە ئاشکرا دەکات کە هەرچەندە دەستوورو ڕێککەوتنامەکان هەوڵی ئەوەیان داوە کە چوار دەوری ئازادی ڕادەربڕین بە کۆمەڵێك پیرۆزیی بگرن، بەڵام بەبێ بێگومان واقیعی مرۆیی ڕۆژێك لە ڕۆژان لەگەڵ ئەو پیرۆزییەدا ڕووبەڕووی پێکدادان دەبنەوە، لەبەرئەوە تەنانەت پارێزەرانی دەستوور ناچار دەبن ئازادی ڕادەربڕین لەو بەرزییەی خۆیەوە بهێننە خوارەوە، بۆ ئەوەی شوێنی سرووشتی خۆی لە نێوەندی سیستەمەکانی مافو بەرپرسیارێتییەکانی دیکەدا بگرێت کە هیچ کۆمەڵگەیەك بەبێ ئەوانە دانامەزرێت.

دادگای باڵا بە درێژایی مێژووی خۆی ئەوەی ڕەتکردۆتەوە کە پاراستنی دەستووریی ببەخشێتە هەموو ئەو جۆرە گوزارشتکردنانەی کە دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی دوژمنایەتیو خراپەکاری لە ناو کۆمەڵگەدا، یان زیان بە ئاسایشی

نەتەوەیی بگەیەنێت و سوور بووە لە سەرئەوەی کە پاراستنی دەستووریی ئەنجام نادرێت تەنها بۆ گوزارشتکردنێك نەبێت کە بەهایەکی کۆمەڵایەتی هەبێت و بەشداری بکات لە گەشەسەندنی کۆمەڵگەو بوژاندنەوەی فیکرو پەرەپێدانی زانستەکان و هونەرو رێکوپێککردنی رۆشنبیری و پاڵپشتی کردنی رەوشتەکان و بەها جوانەکان و ئاشکرا کردنی راستییەکان و گەشەپێدانی عەقڵەکان و پاراستنی مافەکان و ئازادییەکان، چونکە ئازادی گوزارشتکردن لە خودی خۆیدا ئامانج نییە، بەڵکو هۆکارێکە بۆ هێنانەدی کۆمەڵگەیەکی باشتر، ئەمەش چەند جارێك لە لایەن دادگاوە باس کراوەو دووبارە کراوەتەوە لە وردەکاری بڕیارەکانیدا سەبارەت بە زۆر مەسەلە، لە پێناو سووربوونی دادگا لەسەر پاراستنی گوزارشتکردنی سوودبەخش بۆ کۆمەڵگە پاراستنێکی تایبەتی بەخشیوەتە گوزارشتکردنی سیاسی بە پلەیەك کە دادگا سزای بوختان کردنی بەرامبەر بە لێپرسراوی گشتیی بە کەمتر داناوە لەو سزایەی کە بۆ بوختانکردن بەرامبەر هاوولاتییەکی ئاسایی بڕیاری لەسەر دراوە، ئەمەش تاوەکو رێگە بە بواری رۆژنامەگەریی بدرێت بە ئازادییەکی زیاتر رەخنە لە بەرپرسەکان بگرێت و چاودێری هەڵسوکەوتەکانیان بکات..

بەڵام بوختان کردن بۆ هاولاتی ئاسایی ئەو سوودەی نییەو پاشانیش شیاوی هیچ جۆرە پاراستنێك نییە، ئەمەو دادگا بڕیاری داوە بە نادەستووریی بوونی هەر یاسایەك کە سنوور بۆ ئازادی دەربڕینی سیاسی دابنێت بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان، لەوانەش بڵاوکراوەکان و خۆپیشاندانەکان و رێپێوان و مانگرتنەکان و پەناگیرییەکان، ئەمەش بەهۆی بڕوابوونی دادگا بە سوودمەندبوونی گوزارشتکردنی سیاسی لە پاراستنی دیموکراسییەت و رێگری کردنی لە چەوساندنەوەو سەرکوتکردندا.

سەرەرای ئەم باوەڕبوونەی دادگا بەوەی کە ئازادی گوزارشتکردن رەها نییەو هۆکارێکە بۆ بەرزبوونەوەی کۆمەڵگەو ئامانجیش نییە لە خودی خۆیدا، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرینەی دادوەرەکانی دادگا وا دەبینن کە ئەو گوزارشتەی دەبێتە مایەی وروژاندنی تووڕەیی و رق لە ناو کۆمەڵگەدا یان سووکایەتی، یان رق هەستاندنی کەمینەکان دەچێتە بازنەی ئەو گوزارشتکردنەوە کە دەستوور پارێزگاری لێدەکات و ئەم بۆچوونەی زۆرینەی دادوەرەکانیش ئەو بڕیارەی دادگا دەیسەلمێنێت لە ساڵی (١٩٩٢)دا تایبەت بە دۆسیەکەی شاری "سانت پۆڵ" دەریکرد کە هاتوهاوریکی گەورەو رەخنەیەکی توندوتیژی بەرامبەر دادگای باڵا لێکەوتەوە بەهۆی پاراستنی ئەو گوزارشتەی کە دوژمنایەتی لە ناو کۆمەڵگەدا دەوروژێنێت و لەوانەشە ئەو بڕیارە کە لە ساڵی (١٩٩٢) دەرکرا وەك بیرخستنەوەیەك بووبێت بۆ گەلی ئەمەریکی بەوەی کە دادگای باڵای ئەمەریکی تا ئێستاش رێگە بە بازنەیەکی فراوان لە ئازادی گوزارشتکردن دەدات و پاراستنی دەستوورییش دەبەخشێتە جۆرەها گوزارشت کە لەوانەیە لە هیچ شوێنێکی دیکەی ئەم جیهانەدا هیچ پارێزگارییەکی لێنەکرێت، تا ئێستاش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا سەرەرای بوونی دەسەلاتێکی زۆری یەهود تیایدا لە رووی سیاسی و ئابوری و راگەیاندنەوە تاکە دەوڵەتێکی رۆژئاوایە کە نازییە نوێکان دەتوانن تیایدا هەستن بە ئەنجامدانی رێپێوان لەو ناوچانەدا کە یەهودییەکانی تێدا کۆبوونەتەوە، بەهۆی ئەو پاراستنە دەستوورییەی کە دراوەتە ئەو جۆرە رێپێوانانە وەك جۆرێك لە گوزارشتکردنی ئاشتییانە، تا ئێستاش ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەو دەوڵەتەیە کە دەتوانرێت تیایدا هەر جۆرە وتارێك بڵاوبکرێتەوە کە گومان لە راستی هۆلۆکۆست بکات، یان رق و تووڕەیی هەر کەرتێك لە کەرتەکانی کۆمەڵگە بوروژێنێت پلەو پایەو دەسەلاتیشی هەرچەندێك بێت، ئەمەش بە هۆی ئەو پاراستنە دەستوورییەی کە دادگای باڵا دەیبەخشێتە ئەو جۆرە گوزارشتکردنانە, کە ئەمەش وا دەکات بازنەی گوزارشتکردنی رێپێدراو لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا لە هەر شوێنێکی دیکەی ئەم جیهانە فراوانتر بێت.

بەڵام دەستووری ئەمەریکی کە دەستی حکومەتی ئەمەریکی ئیفلیج کردوە بەوەی کە ناتوانرێت دەست بۆ ئازادی گوزارشتکردن بەرێت بەبێ مۆڵەتی دادگای باڵا رێگە لە کۆمەڵگەی ئەمەریکی نەگرتووە لە مومارەسەکردنی هەر جۆرە چاودێرییەك بەسەر گوزارشتکردنەوەو هەوڵدانی بەستنەوەی، مادام حکومەت دەستوەرناداتە ئەو هەوڵانەوە, بەڵکو دەستوور بە رێگرتن لە حکومەت بۆ سزادانی گوزارشتە وروژێنەرەکان بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هانی کۆمەڵگەی داوە

کە لە برێتی حکومەت بەو کارە هەستێت، ئەمەش وای لە زۆرێك لە تایەفەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی ئەمەریکی کردووە، هەستێت بە دانانی هەندێك کۆت و بەند بەسەر ئازادی گوزارشتکردنەوە لە ناو کۆمەڵگەدا، نموونەکانیش لەسەر ئەمە زۆرن:

. نزیکەی هەموو زانکۆ ئەمەریکییەکان ئەو شتەیان تێدایە کە بە بنەماکانی رادەربڕین (speech code) ناو دەبرێن، ئەمەش ڕێ بە قوتابیان نادات، بۆ پەلاماردان و ڕەخنەگرتن لە کەمینە ڕەگەزیی و ئاینییەکان یان سێکسبازە لادەرەکان (شواذ ـ هـۆمۆسـێکسـوال)، هەر کەسێك پێچەوانەی ئەو بنەمایانە بجولێتەوە سزا دەدرێت بە دەرکردنی هەتا هەتایی لە زانکۆ، یان بێبەشکردنی کاتیی لە خوێندن، یان سەرزەنشتکردنی زارەکی، یان هەندێ سزای ڕەمزی، بۆ نموونە زانکۆی "میشیگان" هەستا بە لێکۆلینەوە لەگەڵ یەکێك لە قوتابییەکانیدا تەنها لەبەرئەوەی لە میانەی گفتوگۆکانی وانەیەکدا وتبووی کە ئەو پێیوایە لادانی سێکسی نەخۆشییەکە پێویستە چارەسەر بکرێت، هەر بۆیە کۆتایی مەسەلەکە بەوەهات کە قوتابییەکە ڕەوانەی دادگای فیدراڵی کرا.

لە حاڵەتێکی تریشدا سزای قوتابییەکی تر درا بە "٣٠ سەعات" کارکردن وەك خزمەتێکی کۆمەڵایەتی، چونکە زاتی ئەوەی کردبوو کە سەرکردەی ڕەش پێستی ئەمەریکی "مارتن لۆسەر" بە کەسێکی شیوعی ناوزەد بکات.

ـ "مایکل جاکسۆن"ی گۆرانی بێژی بەناوبانگ گێژەڵوکەی تووڕەیی لە ڕیزی هەندێك لە یەهودییەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکاندا هەژاند بە هۆی بەکارهێنانی چەند وشەیەك لە گۆرانییەکانی ئەم دواییەیدا کە یەهودییەکان پێیان قبووڵ نەبوو، ئەمەش وایکرد بە دژایەتی کردنی سامیەت تۆمەتباری بکەن، ئەو تووڕەبوونەی یەهود "جاکسۆن"ی ناچار کرد جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ ناو ستۆدیۆ تا ئەو وشانەی کە یەهود ڕەتی دەکەنەوە بە وشەی دیکە بگۆڕێت.

ـ لە هاوینی ساڵی (١٩٩٥)دا گروپێکی تایبەت بە جەنگە دێرینەکان هەستا بە چەند هەوڵێکی سەرکەوتوو بۆ دورخستنەوەی هەموو ئەو بەڵگەنامانەی کە باس لەو نەهامەتیانە دەکات لە ئەنجامی ئەو دوو بۆمبە ئەتۆمییە سەریان هەڵدا کە ئەمەریکا لە ساڵی (١٩٤٥)و لە میانەی جەنگی جیهانی دووەمدا بەسەر یاباندا بەریدانەوە، ئەمەش لە پێشانگایەکی تایبەت بە نمایشکردنی مێژووی جەنگی جیهانی دووەم لە واشنتۆن ڕوویدا. بۆیە زۆرێك لە مێژوو نووسەکان بەرامبەر بەم کارە نارەزاییان دەربڕی و بەو شێوەیە وەسفیان کرد کە سەپاندنی جۆرێکە لە "مێژوویەکی نەخشە بۆ کێشراو، بەمەبەستی ڕازیکردنی هەستە نیشتمانییەکان"، لەسەر حسابی مێژوویەکی ڕاستەقینە.

. لە ئەمەریکادا ئەو فیلمانەی کە ڕیزبەندی کراون "تەنها بۆ گەورەکان" ناتوانرێت بە یاسا قەدەغە بکرێن، بەڵام کۆمەڵگە چەندین جۆر فشاری جیاواز لەسەریان بەکاریان دێنێت، بۆیە زۆرێك لە سینەماکان پەخش کردنیان ڕەتدەکەنەوە، دووکانی ڤیدیۆکانیش نایان کڕن و وێستگەی تەلەفزیۆنی و زۆربەی ڕۆژنامەکانیش ڕازی نابن ڕیکلامەیان بۆ بکەن، ئەمەش وا لە بەرهەمهێنەرەکانی ئەو جۆرە فیلمانە دەکات ئەو بەشە ناشیرین و خراپانە لە فیلمەکانیاندا بسڕنەوە، بۆ ئەوەی فیلمەکە لەو خانەیەدا ڕیزبەند نەکرێت کە "تەنها بۆ گەورەکان" بێت.

. زۆرێك لە سینەماکان پەخشکردنی فیلمی "الأغراء الأخير للمسيح"یان ڕەتکردەوە، بەهۆی فشاری کڵێساو ڕێکخراوە ئاینییەکان، بەڵام ئەو سینەمایانە کە پێیان بە جەرگی خۆیاندا ناو فیلمەکەیان پەخش کرد ڕووبەڕووی گەمارۆدانی جەماوەرێکی دیندارو هەوڵەکانی ڕێگرتن لە چوونە ژورەوەی بینەران بوونەوە.

ـ زۆرێك لە کتێبخانە گشتییەکان لە ژێر فشاری جەماوەردان و خۆیان بە دوور دەگرن لەوەی ئەو کتێبانە هەڵبژێرن کە هەستی ڕای گشتیی دەوروژێنن، جا سەرەڕای ئەو ئازادی بڵاوکردنەوە نیمچە ڕەهایەی کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا هەیە، بەڵام هەندێك کتێب زۆرجار کەس نییە بیانکڕێت، یان پەخشیان بکات، یاخود ڕیکلامیان بۆ بکات.

. هەموو ئەو ڕێکخراوانەی کە دادەمەزرێن بۆ ئەوەیە تاوەکو بەگژ جۆرێك لە جۆرەکانی گوزارشتکردندا بچنەوە، وەك ڕێکخراوەکانی "زۆرینەی ئەخلاقی" و "یەکێتی فیدراڵی بۆ ڕەوشتی تەندروست" کە ئامانجیان بەگژاچوونەوەی ئەو فیلم و گۆڤارانەیە کە لە ڕووی سێکسییەوە ئابڕووبەرو نەشیاون، ڕێکخراوی "وردبینی لە ڕێکخراوی زانستیدا" کە

دژایەتی بۆچوونە چەپەکانی هەندێك لە مامۆستایانی زانکۆکان دەکەن، بۆ نموونە یەکێك لە مامۆستاکانی زانکۆی کالیفۆرنیا دووچاری شۆك بوو کاتێك ڕایگەیاند وانەیەك سەبارەت بە "کوبا" دەڵێتەوە، ئەو ڕێکخراوە هانی لایەنگرەکانی خۆیدا ڕێگە لە وتنەوەی ئەو وانەیە بگرن و لە هەوڵێکدا بۆ ڕێگرتن لە چوونە ژوورەوەی جەماوەر چوار دەوری ئەو شوێنەیاندا کە مامۆستاکە بە نیاز بوو وانەکەی تێدا بڵێتەوە.

.. "تیبر گۆر"ی ژنی سیناتۆر "ئال گۆر"ی جێگری پێشووی سەرۆکی ئەمەریکا [1] لەگەڵ ژنانی نوێنەرە ئەمەریکییەکان هەستان بە پێکهێنانی گروپێکی فشار بۆ سەر بەرهەمهێنەرانی گۆرانی و کاسێتە مۆزیکییەکان بۆ ئەوەی هەستن بە دانانی هێما بە سەر ئەو گۆرانیانەوە کە ناوەڕۆکەکانیان سێکسین ئەمەش کاریگەرییەکی باشی هەبوو لە کەمکردنەوەی وتە نەشیاوەکاندا، هەتاوەکو بەرهەمهێنەرەکان دوورکەونەوە لە دانانی هۆشداریدان بەسەر کاسێتەکانیانەوە، کە هەلی فرۆشتن لە دووکانە گەورەکاندا کەمدەکاتەوە، (هەروەك ئەوەی لەگەڵ ئەو فیلمانە ڕوودەدات کە لە خانەی "تەنها بۆ گەورەکان" دا ڕیزبەندی کراون).

.. دەرهێنەری بەناوبانگ "ستیڤن سبیلبرگ" ناچار بوو پشت بە ڕای دوو کەس لەسەرکردە ڕاستڕەوەکانی مەسیحی ببەستێت لەمیانەی بەرهەمهێنانی فیلمی "الأمير موسى" (موسای ئەمیر) بۆ ئەوەی بەرهەم هێنەرەکان دڵنیابن لەوەی کە لەسەر دەستی ڕیکخراوە ئاینییە مەسیحییەکانەوە ڕووبەڕووی گەردەلولی نارەزایی و دابڕان نابێتەوە.

.. قوتابخانە ئەمەریکییەکان ~~زۆرجار ڕووبەڕووی فشاری کێش~~انەوەو لابردنی هەندێك کتێب لە کتێبخانەی قوتابخانەکانیاندا دەبنەوە، چونکە باوکەکان ڕازی نابن منداڵەکانیان ئەو جۆرە کتێبانە بەهۆی ناوەڕۆکەکەیانەوە بخوێننەوە، زۆر جار بەڕێوەبەرێتی قوتابخانە وەڵامی ئەو فشارانە دەداتەوەو هەڵدەستێت بە کێشانەوەی ئەو کتێبە ڕەتکراوانە، زۆرجاریش کتێبخانەی قوتابخانەکان خۆیان لە کڕینی ئەو جۆرە کتێبانە بەدوور دەگرن کە دەبێتە مایەی وروژاندنی بیرکردنەوەی هەندێك لە باوکان.

هەندێك قوتابخانە کە ڕازی نەبوون هەندێك لەو کتێبانە لە کتێبخانەکانیاندا بکێشنەوە دووچاری فشارێکی زۆر بوونەوە کە بە هەڕەشەکردن بە کێشانەوەی منداڵەکانیان لە قوتابخانەکاندا دەستی پێکرد تا گەیشتە خۆپیشاندان و گەمارۆدانی بینای قوتابخانەکان، بەڵکو مەسەلەکە گەیشتە ئەو ئاستەش کە لە هەندێ قوتابخانەدا کاری توندوتیژی و تەقاندنەوەی بۆمبی تێدا بەکاربهێنرێت.

لە ڕاستیدا چاودێریکردن و بەرتەسککردنەوەی ئازادی گوزارشتکردن بەتەنها تایبەت نییە بە حکومەتەکانەوە، چونکە هەموو کۆمەڵگە مرۆییەکان مومارەسەی جۆرێك لە چاودێریکردن بەسەر ئەو گوزارشت و ڕایانەوە دەکات کە لە کۆمەڵگەدا بەکاردەهێنرێن، وە ئەو هەوڵانەشی کە گروپە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی ئەمەریکی پێیان هەڵدەستێت بۆ بێدەنگکردنی هەندێك دەنگ ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەگەر دەوڵەتیش ڕێگە بە ئازادی ڕەهای هەموو بیروڕاکان بدات ئەوا کۆمەڵگە ڕێگە بەوە نادات و بە زۆر ڕێگە هەوڵ دەدات لە هەندێك جۆری گوزارشتکردن ڕزگاری بێت، هۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ سرووشتی خودی گوزارشتکردنی مرۆیی، چونکە گوزارشتکردنی وا هەیە هەستەکان دەوروژێنێت و هەیانە عاتیفەکان بریندار دەکات و یان دەبێتە مایەی تووڕەیی دیندارەکان و ڕقی نیشتمان پەروەرەکان، زۆر کەس حەز دەکەن لەو گوزارشت و ڕایانە ڕزگاریان بێت کە بێزاریان دەکات، ئەمەش یان بۆ پارێزگاریکردنە لە ئارامی و خۆشی خۆیان، یان پاراستنی ڕەوشتی منداڵەکانیانە، یاخود بزاوتنی هەست و غیرەتیانە بەرامبەر بە ئاینەکەیان، یان سوربوونیانە لەسەر پاراستنی ڕێزوکەرامەتی نیشتمانەکانیان، .. هتد.

جێی سەرسوڕمانە کە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکان بەگشتی و کۆمەڵگەی ئەمەریکی بە تایبەتی بەتواناترینی ئەو کۆمەڵگەیانەن لە مومارەسەکردنی چاودێریکردن و بەرتەسککردنەوەی ئازادی ڕادەربڕین و گوزارشتکردندا، هۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ هێزی کۆمەڵگەی مەدەنی لەو وڵاتانەداو لێهاتوویی زۆری تاکەکانی کۆمەڵگە بەشێوەیەکی گشتیی لە

[1] ـ ئال گۆر) لە سەردەمی سەرۆکایەتی "بیل کلیتۆن" دا ١٩٩٣ ـ ٢٠٠١ جێگری سەرۆك کۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو. "وەرگێر".

ڕێکخستنی خۆیانداو بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیانو گردبوونەوە بەدەوری ئامانجێکدا کە کۆیان دەکاتەوە، بەبێئەوەی پێویستیان بە هیچ دەستێوەردانێکی دەوڵەت هەبێت، ئەمەش وا دەکات ئەو چاودێریکردنەی کە هەر کۆمەڵگەیەکی مەدەنی چالاك مومارەسەی دەکات کاریگەری هەبێت لە کۆتکردنی ئازادی گوزارشتکردندا کە کاریگەرییەکەی وەك کاریگەری یاساو شەریعەتەکانە یاخود زیاتریشە, چونکە یاسا پشت بە زیندانی کردن یان غەرامەکردنی دارایی دەبەستێت، وەك هۆکارێك بۆ تەمێ کردنی ئەو کەسەی لە گوزارشتکردندا بیر لە بەزاندنی هێڵە سورەکان دەکاتەوە، لەبەرامبەریشدا کۆمەڵگەی مەدەنی چالاك ئەو ئامرازانەی هەیە کە لە لێهاتووییاندا هیچیان لەوانە کەمتر نییە، وەك دەرکردن لەسەر کار یان ڕاگرتنی لە خوێندن، یاخود بێبەشکردنی لە ئەندامێتی یانە کۆمەڵایەتییەکانو دامەزراوە ئاینییەکان، یاخود دابڕاندنو گەمارۆی ئابووری .. هتد بۆیە ئەم توانا زۆرەی کۆمەڵگەی ئەمەریکی لە کۆتکردنی ئازادی گوزارشتکردندا بەبێ پێویست بوونی بەدەسەڵاتی دەوڵەت وای لە فەیلەسوفی فەرەنسی "الکسیس دوتوکفیل" کرد بەم شێوەیە باس لە کۆمەڵگەی ئەمەریکی بکات کە دەڵێت: "هیچ شوێنێك پێنازانم سەربەخۆیی عەقڵو ئازادی گفتوگۆکردنی کەمتر لە ئەمەریکا تێدا بێت".

## سەلمان ڕوشدیو ئازادی ڕادەربڕین

کاتێك کتێبی (آيات شيطانية) لە بەریتانیا لە ساڵی (١٩٨٨) بڵاوبوویەوە یەکێتی ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی بەریتانیا هەستا بە هەوڵی قەدەغە کردنی دەستاو دەستکردنی کتێبەکەو سزادانی نووسەرەکەی بەپێی یاسای قەدەغەکردنی جنێودان بە پیرۆزییەکان، یەکێتییەکە هەستا بە نووسینی نووسراوێك لەو بارەیەوە بۆ "مارگرێت تاتشەر"ی سەرەك وەزیرانی ئەو کاتەی بەریتانیا، وەڵامی سەرەك وەزیران لەسەر داواکارییەکانی یەکێتی ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی بەریتانیا ئەوەبوو کە حکومەتەکەی لە هیچ حاڵەتێکدا ناتوانێت ئەو کتێبە قەدەغە بکات، هۆی ئەوەشی بەوە ڕونکردبوویەوە کە وتبووی: "بەشێکی بنەڕەتی لە سیستمی دیموکراسیمان پێکهاتووە لەوەی کە هەموو ئەو کەسانەی ڕێز لە یاسا دەگرن پێویستە توانای ئەوەیان هەبێت بە ئازادییەکی تەواوە گوزارشت لە ڕاکانیان بکەن".

پاش ئەوەش یەکێتی ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی بەریتانیا هەوڵیدا سەرۆکی ئەنجومەنی لۆردەکانو جێگری گشتیو وەزارەتی دەرەوە بە داواکارییەکانیان ڕازی بکەن، بەڵام هەموو ئەو هەوڵانەش شکستیان خوارد.

وتەبێژ بە ناوی وەزارەتی دەرەوە بەم شێوەیە وەڵامی داواکارییەکانی موسڵمانانی بەریتانیای دایەوە: "حکومەتی بەریتانیا دوو بنەما بەڕێوەی دەبات: ئازادی بیروڕاو گوزارشتکردن، سەروەری یاسا". بێگومان وەڵامی بەرپرسە بەریتانییەکان خاڵی نەبوو لە جیاوازییەکی ڕوونو ئاشکرا، تەنانەت لە سووکایەتی کردنیش بەهەستی کەمینە موسڵمانەکەی بەریتانیاو هەستی موسڵمانان لە هەموو جیهاندا، ئەمەش لەبەرئەوەی بەریتانیا بەخۆی خودی ئەو دەوڵەتەیە کە یاساکەی ڕێگە لە جنێودان بە پیرۆزییەکانی مەسیحییەت دەگرێت کە سیستمە قەزاییەکەی بە تەواوەتی لە دژی ناشیرینکردنی کەسایەتی حەزرەتی مەسیح سەلامی خوای لێ بێ ڕاوەستاوە، دادگاکانی بە جیاوازی ئاستەکانیانەوە بڕیاریانداوە بەغەرامەکردنی هەر کەسێك بەشداری لەوەدا کردبێت بەکوێرایی چاوی[1] ئەو ئازادی گوزارشتکردنەی کە سەرەك وەزیرانو وتەبێژی وەزارەتی دەرەوە لەوەڵامدانەوەی داواکاری موسوڵمانەکاندا شانازییان پێوە دەکرد.

لە ڕاستیدا حکومەتەکانو دەزگا ئیعلامییەکانی ڕۆژئاوا لە هەڵمەتە دڕندانەکەیاندا دژ بە تووڕەیی موسڵمانان لەسەر کتێبی "آيات شيطانية"و سەلمان ڕوشدی نووسەری کتێبەکە بە تەواوی ئەوەیان لە بیر خۆیان بردەوەو خۆیان گێل کرد لەوەی کە ئازادی گوزارشتکردنی ڕەهاو ئەوەی ڕۆژئاوا بەرگری پێدەکات لە ڕوشدیو کتێبەکەی هیچ بوونێکی نییەو بە ڕاستیش ڕۆژئاواو حکومەتەکانیو کۆمەڵگەکانیو دەزگاکانی ڕاگەیاندنی بێتاوان نین لەو گوناهەی کە موسڵمانانی پێ

[1]- ئەم دەستەواژەیەم بە بەکارهێنانە باوەکەی لە ناو کورددا بەکارهێناوەو وەرمگێڕاوە کە لە دەقە عەرەبییەکەدا بەم شێوەیە هاتووە( رغم أنف الحرية) کە ئەگەر بکرێتە کوردی ئەوا واتا پڕاو پڕەی نابێت کە لە دەقە عەرەبییەکەدا هەیە. "وەرگێڕ".

تۆمەتبار دەکرێت، ئاخۆ بڵاوکردنەوەی چەند کتێب قەدەغە کرابێت لە زیاتر لە دەوڵەتیکی ڕۆژئاواییداو چەند بڵاوکار بەهۆی بڵاوکردنەوەی کتێبێکەوە غەرامە کرابێت و چەند نووسەر بەهۆی نووسینەکانیانەوە دادگایی کرابن و چەند ڕا بە ئەنقەست پشتگوێ خرابێت و بەمەبەستێکیش کرابێت بە ژێر خۆڵەوە، چونکە لەگەڵ حەزی ڕۆژئاوادا نەگونجاوە، پاشان ڕۆژئاوا دێت و پاش ئەم هەموو شتە هێشتا موسڵمانان بە دۆگماو دواکەوتوو و بێتوانا لە تێگەیشتن و دەرککردن بە بەها باڵاکانی ئازادی گوزارشتکردن وەسف دەکات. هەروەها ڕۆژئاوا بە تەواوەتی خۆی گێل کرد لەوەی کە تووڕەیی بە هۆی جۆشخواردنی هەستی ئایینی و پێشێلکردنی پیرۆزییەکان داهێنانێکی توندڕەوانەی ئیسلامیی نییە، چونکە یاساکانی قەدەغەکردنی جنێودان بە پیرۆزییەکانی مەسیحییەت لە بەریتانیاداو ڕێنەدان بە فیلمی "الأغراء الأخیر للمسیح" لە زۆربەی وڵاتە ڕۆژئاواییەکانداو گەمارۆدان و بایکۆتکردنی ئەو سینەمایانەی کە هەستان بە نمایشکردنی فیلمەکە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و دادگاییکردنی بەڕێوەبەری فیستڤاڵی ڤینیسیا کە بۆ فیستڤاڵەکە فیلمەکەی لە خۆ گرتبوو، پشتبەستنی گەورە بەرهەمهێنەرەکانی فیلم لە هۆلیوددا بە سەرکردەکانی ڕەوتی ئایینی مەسیحیی لە چاودێریکردنی ناوەرۆکی فیلمە ئایینیەکان و خۆپاراستن لە وروژاندنی تووڕەیی دیندارە مەسیحییەکان و .. هتد، بە ڕوونی ئەوە دەسەلمێنێت کە ڕۆژئاوا بێئاگا نییە لە کاریگەری سۆزی ئایینی لە ناو دڵەکاندا، دورکەوتنەوە لە وروژاندنی هەستی دیندارەکان یەکێکە لەو هۆکارە بنەڕەتیانەی کە بەکاردێت لە بیانو هێنانەوە بۆ کۆت و بەندکردنی ئازادی گوزارشتکردن لە هەموو ناوچەکانی ڕۆژئاواداو بە ڕادەیەک کە دادوەری دادگای پێداچوونەوەی بەریتانی کە بڕیاری غەرامەکردنی بڵاوکاری ئەو قەسیدەیەی پەسەند کرد کە سوکایەتی بە کەسایەتی حەزرەتی مەسیح سەلامی خوای لێ بێت دەکات، لە وردەکاری بڕیارەکەدا دەڵێت: "گەورەترین تاوانێك کە پێنووس بتوانێت ئەنجامی بدات بریتییە لە جنێودان بە خوداو هێرشکردنە سەر ئایین بە مەبەستی پوچەڵکردنەوەی بڕوای خەڵکی بە خودا، یاخود کەمکردنەوەی ئەو ڕێزە بۆی دادەنرێت". پاش هەموو ئەمانە هێشتا ڕۆژئاوا تووڕەبوون بە ناوی ئایینەوە بە دیاردەیەك لە دیاردەکانی توندڕەوی ئیسلامیی لە قەڵەم دەدات.

لە ڕاستیدا بەرگریکردنی بەردەوامی ڕۆژئاوا لە سەلمان ڕوشدی و کتێبەکەی و ئەو هێرشە ئاسەوار توندانەی بەسەر هەوڵی موسڵمانەکانەوە بۆ قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوەی کتێبەکەو دادگایی کردنی نووسەرەکەی و ئەو گوێنەدانە زەقە بە هەستی موسڵمانەکان بەرگریکردن نەبوو لە بنەمای ئازادی گوزارشتکردن، هێندەی ئەوەی کە گوزارشت بوو بۆ تێنەگەیشتنی ڕۆژئاوا لە ئیسلام و گوزارشت بوو لە مەودای گومان و سڵەمینەوەو ترس و لەرزی ڕۆژئاوا لە هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییان بە ئیسلامەوە هەیە، لە ڕاستیشدا گرفتی ڕاستەقینەی ڕۆژئاوا لە پێشێلکردنی ئازادی گوزارشتکردندا نەبووە کە بەردەوام لە ڕژئاوادا پێشێلکراوە بەبێئەوەی کەسیش نیگەران بێت، بەڵکو گرفتەکە لەوەدایە کە ئەو شتە لە ژێر ئاڵای ئیسلامدا ڕوبدات، چونکە ڕۆژئاوا هەرگیز بەو چاوەوە سەیری ئیسلامی نەکردووە کە ئایینێکی ئاسمانی بێت و شیاوی بەرز ڕاگرتن بێت، هەرگیز هەڵسوکەوتیشی بەو شێوەیە لەگەڵ موسڵماناندا نەکردووە کە خاوەن هەستی ئایینی بن و شیاوی ڕێزگرتن بن.

لە ڕاستیشدا کتێبی (آیات شیطانیة) نەدەبووە خاوەنی هیچ ناوبانگێك یان پارێزگاری لێکردنێك یاخود ڕێزگرتن لە ڕۆژئاوادا، ئەگەر بهاتایەو دەستی بۆ بیروباوەڕەکانی مەسیحیەت ببردایە یان گومانی هەبوایە لە نەهامەتییەکانی یەهود لە جەنگی جیهانی دووەمدا، بەڵام دەستبردن بۆ بیروباوەڕەکانی ئیسلام و بێنرخ کردنی شان و شکۆی پێغەمبەرەکەی (درودی خوای لەسەر بێت) بەهەمان شێوە مامەڵەی لەتەکدا ناکرێت، چونکە مافی ئازادی گوزارشتکردن مافێکە ڕۆژئاوا دەیبەخشێتە تەنها چەند بابەتێك لەسەر حسابی هەندێکی تر، مافی ئازارنەدان بە هۆی گوزارشتکردنەوە تەنها دەدرێتە هەندێك کەس و هەندێکی دیکەی لێ بێبەش دەکرێت، بە گوێرەی ئەو شتەی کە تینوێتی مەزاجی ڕۆژئاوا دەشکێنێت.

زۆرێك لە ڕۆژئاواییەکان پۆزش دەهێننەوە لە بەرامبەر ئەو بەرگریکردنەی ڕۆژئاوا لە سەلمان ڕوشدی و کتێبەکەی، هۆی ئەوە دەگەڕێننەوە بۆ فەتواکەی (ئیمام خومەینی) بۆ کوشتنی سەلمان ڕوشدی، بەڵگەشیان ئەوەیە کە ڕۆژئاوا

هەرچەندە بەشێوەیەکی ڕەها مومارەسەی ئازادی گوزارشتکردن ناکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز کوشتن وەك سزایەك بەکارناهێنێت لە بەرامبەر گوزارشتکردن لەهەر جۆرە ڕایەك، توندترین سزادانێك کە یاسا ڕۆژئاواییەکان سەبارەت بە ئازادی گوزارشتکردن پابەندن پێوەی بریتیە لە غەرامەکردن یان بەندکردن بۆ ماوەیەکی تا ڕادەیەك کورت، جا سەرەڕای ڕاستی ئەو وتانە، بەڵام مەسەلەکە بەو شێوە سادەیە نییە، چونکە ڕۆژئاوا بە تەواوی ئەوە دەزانێت کە زۆربەی زانا موسڵمانەکان‌و خەڵکە ڕەشۆکەکەش پشتیگیرییان لە فەتوای کوشتنی سەلمان ڕوشدی نەکردوە، هەروەها فەتواکەی خومەینی هەر لەسەرەتاوە ئەوە نییە جەماوەری موسڵمانان پێوەی پابەند بن، چونکە زۆربەی زۆری موسڵمانان شوێنکەوتەی مەزهەبی شیعە نین. ئامانجیش لە داواکارییەکانی موسڵمانانی ئەوروپا بریتبوو لە قەدەغەکردنی کتێبی (آيات شيطانية)و دادگاییکردنی (ڕوشدی) بە پێی یاساکانی جنێودان بە پیرۆزییەکان، لەو بوارەدا ئیسلامیش وەك مەسیحیەت مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، زیاد لەوەش خودی فەتواکەی خومەینی دەرنەچوو هەتا ئەو کاتەی کە بەریتانیا سوور بوو لەسەر دادگایی نەکردنی نووسەر یان بڵاوکاری کتێبەکە، پاش ئەوەی کەخۆپیشاندانەکان دژ بە کتێبەکە لە پاکستان‌و هیندستاندا زیادیان کرد بەشێوەیەك کە بووە هۆی بەرپابوونی توندوتیژی تایەفەگەری لە نیمچە کیشوەری هیندیداو کوژرانی زۆرێك لە خەڵکی، لە ڕاستیشدا خۆپڕکردنی ڕۆژئاوا دژی هەستی موسڵمانەکان لە بەرامبەر کتێبەکەدا بەر لە فەتواکەی خومەینی دەستی پێکرد، نەك پاش ئەوە، زیاد لەوەش ڕەتدانەوەی فەتواکەی خومەینی لەلایەن ڕۆژئاواوە نابێت بکرێتە بیانوویەك بۆ گەورەکردنی کتێبەکەو نووسەرەکەشی بخرێتە ئاستی پاڵەوانەکان، بەڕادەیەك کە (بیل کلینتۆن)ی سەرۆکی ئەمەریکا لە کۆشکی سپیدا میوانداری بکات‌و (تۆنی بلێر)ی سەرەك وەزیرانی بەریتانیاش بۆ ئێوارە خوانێك لە ماڵەکەی خۆیدا بانگهێشتی بکات و سەرۆکی حکومەتەکان لە وڵاتە جیاوازەکاندا بە ئەنقەست دەیانەوێت لە چەند دیمەنێکدا بۆ یادگاری لەگەڵیدا دەرکەون، تا ئەو ڕادەیەی وابکات (بوب رای) سەرەك وەزیرانی پێشووی کەرتی "ئونتاریۆ" لە کەنەدا لە هەڵمەتە هەڵبژاردنەکەیداو لە ساڵی (١٩٩٥)دا بۆ دووبارە هەڵبژاردنەوەی ڕایبگەیەنێت کە ئەو یەکەم سەرۆك حکومەت بووە لە هەموو جیهاندا کە بە سەلمان ڕوشدی گەیشتووە، بەمشێوەیە تەنها گەیشتن بە سەلمان ڕوشدی بوو بە ئامرازێك بۆ ڕاکێشان‌و بەدەستهێنانی دەنگەکان لە هەڵبژاردنەکانی ڕۆژئاوادا!.

لە نێوەندە ڕۆشنبیرییەکانی ڕۆژئاوادا پلەو پایەیەکی دراوەتێ کە زۆر لە قەبارەی خۆی گەورەترە، بەڕادەیەك کە هەندێك لە ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوا شکایەتی ئەوە دەکەن کە لە ئێستادا ناتوانرێت لە ڕۆژئاوادا ڕەخنە لە سەلمان ڕوشدی بگیرێت. ئەمەش دەقاو دەق لەگەڵ "ئان ماری شیمل"ی ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانیدا ڕوویدا کاتێك ڕەخنەی لە کتێبی (آيات شيطانية) گرتبوو بە هۆی هێرشکردنە سەر پیرۆزییەکانی موسڵمانان‌و بێنرخ کردنی گەورەیی قورئان‌و ناشیرینکردنی کەسایەتی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ)، لە کاتێکیشدا کە ئەم ژنە ڕۆژهەڵاتناسە هەڵبژێررا بۆ وەرگرتنی خەڵاتی کتێبی ئەڵمانی لە ساڵی (١٩٩٥)دا بە مەبەستی ڕێزلێنان لەو نووسراوانەی بە درێژایی پەنجا ساڵی ڕابردوو نووسیویەتی، ڕۆژنامەکانی ئەڵمانیا بە توندی هێرشیان کردە سەری‌و نارەزاییان سەبارەت بە هەڵبژاردنی بۆ ئەو خەڵاتە دەربڕی، تاکە هۆیەکیش بۆ ئەو هێرشکردنە زاتکردنی ئەو ژنە بوو لە ڕەخنەگرتنی سەلمان ڕوشدیدا! بەڵێ، پەنجا ساڵ لە لێکۆڵینەوەو نووسین‌و کتێب دانان شەفاعەتیان بۆ ئەو زانا ئەڵمانییە گەورەیە نەکرد لە بەرامبەر یەك راگەیاندنیدا کە تیایدا ڕەخنەی ئاراستەی سەلمان ڕوشدی کردبوو!

ئایا ئەم هەموو پلەو پایە بەرزە بەرگریکردنە لە ئازادی سەلمان ڕوشدی لە گوزارشتکردنی ئازادانەی ڕاکانی؟ ئەگەر مەسەلەکە بەو شێوەیەیە ئەی بۆچی "جیمس کرکوب" یان "گارودی" هەمان پلەو پایەیان پێنەدراو وەك دوو تاوانبار مامەڵەیان لە تەکدا کرا، بەهۆی گوزارشتکردنی ئازادانەی ڕاکانیان؟ لە ڕاستیشدا ڕۆژئاوا بێئاگایە لەوەی کە کەسانی تریش پیرۆزییان هەیەو پارێزگاری‌و بەرگری لێدەکەن بەتەواوەتی، هەروەك چۆن ڕۆژئاوا بەرگری لە پیرۆزییەکانی خۆی دەکات‌و یاساو بەرنامە بۆ پاکڕاگرتن‌و پاراستنیان دادەنێت، بەداخەوە مەسەلەکە تەنها لەو بێ توانایییە سەیرە لە

تێگەیشتنی ئەوی دیو هەستو پێویستییەکاندا کورت نەبۆتەوە، بەڵکو گەیشتۆتە ڕادەی گاڵتەکردن بەهەر هەوڵێك بۆ پاراستنی ئەو پیرۆزییانە بدرێت لە دەستێوەردانی گێرە شێوێنەکان، وەك ئەوەی تەنها پیرۆزییەکانی ڕۆژئاوا شیاوی پاراستن بن، ئیتر ئەوانی دیکە جگە لە جنێوپێدانو قێزەون کردن شیاوی هیچی تر نین!.

لە ڕاستیشدا ئەم خۆ بە زلزانینە ڕۆژئاواییەو بە کەم تەماشاکردنەی هەستی کەسانی دیکە، زیان بە ڕۆژئاوا دەگەیەنێت، سوودی پێناگەیەنێت، ئاخۆ ڕۆژئاوا چ سوودێکی بینیبێت لە سوکایەتیکردن بە هەستو پیرۆزییەکانی موسڵمانان، جگە لە وەشاندنی تۆوی ڕقو دوژمنایەتی لە دڵی ملیۆنەها موسڵماندا؟ ئایا بە دوژمنکردنی کەسانی دیکە ئامانجێکە ڕۆژئاوا هەوڵی بۆ دەدات؟ ئایا ململانێکردنی شارستانییەتەکان باشترین شتێکە بیکەینە پێشوازی هەزارەی سێیەم بۆ ئەو جیهانەی کە هەمووان بە تەنیشت یەکەوە تیایدا دەژین؟

بەداخەوە ڕۆژئاوا لەو هەڵەیەی کە لە مەسەلەی سەلمان ڕوشدیدا کردی پەندی وەرنەگرت، چونکە هەر بەردەوامە لە درێژەدان بە گرتنەبەری ڕێگای جۆراوجۆر لەو بوارەدا، ئەوەتا خانەیەکی بڵاوکردنەوەی گەورە دەرکردنی چاپێکی میللی لە کتێبی (آيات شيطانية) لە ساڵی (١٩٩٨) [1] دا ڕادەگەیەنێت، ژنە نووسەری بەنگلادیشی (تەسلیمە نەسرین) پاش ئەوەی بە هۆی نووسینەکانیو وتەکانیەوە لەگەڵ ڕۆژنامە هیندییەکان هەستی ڕۆڵەکانی وڵاتەکەی وروژاند بەوەی کە لەو نووسینو وتانەیدا سوکایەتی بە عەقیدەی ئیسلامیی دەکات پاڵی بە هەندێك کەسەوەنا داوای دادگایی کردنی بکەن، کەچی دەبینین دەرگاکانی ناوبانگو تیشك خستنەسەری لە ئەوروپاو ئەمەریکای باکووردا بۆ دەکرێتەوە، بەمەرجێك پێشتر هەرگیز ناوی ئەو نووسەرەیان نەبیستبوو، زۆرێك لە دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان پێشنیازی بۆ دەکەن لە وڵاتەکەیاندا ببێتە پەناهێندەی سیاسی چەندین خەڵاتی ئەدەبی پێبەخشرا کە بە دەیان هەزار دۆلار مەزندە دەکرێت، ئەوەش لەبەرامبەر ئەو کارانەیدا کە پێشتر هیچ کەسێك لە ڕۆژئاوادا پێیان نەزانیوە، وای لێهات بانگهێشت دەکرا بۆ وانەبێژیو بەستنی کۆڕو سیمینار لە هەموو شوێنێکی جیهانی ڕۆژئاوادا (بەم شێوەیە دەستدرێژیکردنە سەر هەستی موسڵمانان ئێستا لە ڕۆژئاوادا بووەتە خێراترین ڕێگە بۆ بەدەستهێنانی ناوو ناوبانگ!).

ڕۆژئاوا بەردەوامو چەندینجار ئەوەی سەلماندووە کە دەستەوسانە لە دیالۆگکردن لەگەڵ ئەویترداو ڕێزگرتنی هەستەکانی، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسەی تریش لەو کەمینانە بێت کە لە ناو ڕۆژئاوادا دەژی، نەك دووربێت لێوەی.

لە ڕاستیشدا بەریتانیا (بۆ نموونە) گوێی بەوە نەداوە ئایینی کەمینەکانی دیکە لە سایەی پاراستنی یاسای حنێودان بە پیرۆزییەکان ڕیزبەند بکات، چونکە ئەو یاسایە تەنها بۆ پاراستنی ئایینی زۆرینە ماوەتەوە لە پشتگوێ خستنێکی زەقدا کە بەهەستی ڕۆڵەی کەمینەکانی بەریتانیا دەکرێت، ئەمەش پاڵی بە هەندێ لە بەریتانییەکانەوە نا (ئەوانەی باوەڕیان بەیەکسانی لەنێوان ڕۆڵەکانی یەك نیشتماندا هەیە)، کە داوای ئەوە بکەن یان پیرۆزییەکانی هەموو ڕۆڵەکانی وڵات بپارێزێت یان ئەو یاسایە بە شێوەیەکی گشتیی لابرێت، بەڵام هەموو هەوڵەکانیان شکستخواردوو بوون، مەسەلەکەش بەوە کۆتایی هات کە موسڵمانی بەریتانی ئەوەی دەستکەوێت یاسای وڵاتەکەی سزای هەر کەسێك دەدات جنێو بە حەزرەتی مەسیح (سەلامی خوای لەسەر بێت) بدات، بەڵام ئەو کەسە سزا نادرێت کە جنێو بە (موحەممەد) "ﷺ" بدات، جا خۆزگە مەسەلەکە هەر لەو ئاستەدا کۆتایی بهاتایە، بەڵام سوکایەتی پێکردنەکە لەوەدا تەواو دەبێت کە هەرکەسێك خراپەی موحەممەد ﷺ باس بکات دەبێتە ئەفسانەو پاڵەوانو هێمایەك لە هێماکانی گوزارشتکردنی ئازادو ئازایەتی نواندن لە رادەربڕیندا بەبێئەوەی کەمترین ڕێز بۆ موسڵمانە بەریتانییەکان دابنرێت، پاش هەموو ئەمەش کۆنگرێسی ئەمەریکی دێتو وڵاتە ئیسلامییەکان وەك میسرو ئەوانی دیکە (نەك بەریتانیا) بەوە تاوانبار دەکات کە کەمینەکانیان دەچەوسێننەوە!.

ڕۆژئاوا بە دەستەوسانی بەردەوامی لە دیالۆگکردن لەگەڵ شارستانێتیەکانی دیکەداو هەوڵدان بۆ تێگەیشتنیانو ڕاگرتنی هەستیانو ڕێزگرتنی پیرۆزییەکانیان ڕێگە بۆ جیهانێك خۆشدەکات کە جگە لە ململانێی شارستانیەتییەکانو

[1] ـ لە دەقە عەرەبییەکەدا نوسراوە "لەم ساڵەدا" ئەو ساڵەش دیارە ساڵی (١٩٩٨) چونکە دەقی عەرەبی ئەم کتێبە لەو ساڵەدا دەرچووە. (وەرگێڕ).

جـەنگی ئایینـەکان هیچـی تـری تێدانییـە، کارێـك دەکـات تیۆرەکـەی "سـامۆئێل هینتگتـۆن" دەربـارەی ململانێـی شارستانێتییەکان پێشبینیەك بێت لە خودی خۆیدا بێتەدی، ئەگەر ئێمە ئەمڕۆ لە جیهانێکدا بژین کە چەکی کۆمەڵکوژی تێدا بڵاوبووەتەوە ئەوا جیهانی سبەینێ جگە لە دوو ئەلتەرناتیڤ هیچی تری لە بەردەمدا نابێت، یان دیالۆگ یاخود وێران بوون.

## رۆژئاوا لە تەرازوودا

گومان لەوەدا نییە کە رۆژئاوا لە تێڕوانینێکی رێژەییەوە قەدەرێکی گەورە لە ئازادی گوزارشتکردنی تێدایە کە ئەمڕۆ لـە هـیچ شـوێنێکی دیکـەی ئـەم جیهانـەدا نموونـەی نییـە، ئـەو ئازادییـە لـە هـەموو ئـەو شـتانەدا کـە پەیوەسـتە بـە گوزارشـتکردنی سیاسـی دەگاتـە ئەوپـەڕی گەیشـتن بـە ئـازادی، مرۆڤـی رۆژئـاوایی ئازادییـەکی نیمچـە رەهـای هەیـە لـە ئاراستەکردنو لێپرسینەوەو رەخنـەگرتن لـە حکومەتـەکان، نـەیارییش (معارضـة) مافێکـە بـۆ هـەموان دەسـتەبەر کـراوە، دامەزرانـدنی حـزبو دەرکردنـی رۆژنامـەو پێکهێنـانی گروپـەکانی فشـاری سیاسـی بـە جۆرێکـە وەك ئـەوەی سنووری بـۆ دانەنرابێت، رێکخستنی رێپێوانو خۆپیشاندانو مانگرتنو دابەشکردنی بڵاوکراوەو مومارەسـەکردنی هـەموو شـێوەکانی نارەزایی دەربڕینـی هێمنانـە تـەنها هـەر هێنـدە نییـە کـە رێگـەی پێـدرابێت، بـەڵکو لـە بەرپرسـیارێتییە نیشـتمانییەکان دەژمێردرێت، بۆ ئەوەی رێگە لە لادانی حکومەتەکان بگرێت.

رۆژئـاوا زۆر جـار سوودی لـە بەرهـەمی ئـەم ئازادییـە زۆرەی گوزارشـتکردن بینیوە لـە رێگـە گـرتن لـە سـەرکوتکردنی سیاسـیو چـاودێری کردنـی حکومەتـەکانو راسـتکردنەوەی خواروخێچـی دەسـتەبژێرە دەسـەڵاتدارەکانو رووبەڕووبوونەوەی دیاردەکانی کەمتەرخەمیو گەندەڵییو خراپەکاری لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش هێشتا ئـەم وێنـە رۆژئاواییـە لـە مومارەسـەکردنی ئـازادی گوزارشـتکردندا خـاڵیو بێبـەش نییە لە کەموکورتیو کەمتەرخەمی، بێگەردو بێ خەوشیش نییە. چونکە حکومەتەکانی رۆژئاوا هەرچەندە مافی ئەوەیان هەیـە کـە کـۆتو بەنـد لەسـەر هەنـدێ جـۆری گوزارشـتکردن دابنـێن بـۆ پاراسـتنی ئاسایشـی نەتـەوەییو ئاشـتی کۆمەڵایەتیانـە، بـەڵام زۆرجـار لـەو بـوارەدا سـنوورەکانی دیموکراسـیەت تێدەپـەڕێنێتو تەنانـەت لـۆژیکی کـۆتو بەندکردنەکـەش دەبـەزێنرێت، زۆرجـاریش نـاوی دیموکراسیەت بـەخراپ بـەکاردەهێنرێت، بـۆ بیـانوو هێنانـەوەی ئـەو مومارەسـاتانەی دەرحـەق بە ئـازادی فیکـرو گوزارشـتکردن دەکـرێن ناکرێـت بەکـەمتر لـە کـارێکی داپڵۆسـێنەرانە باسـی بکرێـت. چـونکە بـەناوی دیموکراسـییەتەوە یاسـا دەردەکرێـت بـۆ بـە تـاوان ناسـاندنی قسـەکردن لـە هەنـدێ بابـەتی دیاریکراودا بە چاوپۆشی لە مەبەستی قسەکەرو شێوازەکەیو جۆری ئەو جەماوەرەی قسەکەی لەگەڵدا دەکرێت، یان ئەو شێوازەی گوتارەکەی پێ دەربڕراوە، هەروەها ئەو یاسـایانە جیـاوازی ناکـەن لـە نێـوان لێکۆڵینـەوەی زانسـتو گـەڕەلاوژێ کردندا، لە نێوان فیکرو گێرەشێوێنیدا، یان لە نێوان دیراسـەکردنی مێـژوییو ئاژاوەنانـەوەدا، بـەناوی دیموکراسیەتەوە "گارودی" بە هۆی فیکرییەوەو "بـەرنارد لـویس" بـەهۆی زانسـتەکەیەوەو "دیڤیـد ئیرفینـج" بـە هـۆی لێکۆڵینەوەکانییەوە سزا دەدرێن، هەر بە ناوی دیموکراسیەتەوە بەتەنها باسکردنی هەندێك بابەت قەدەغە دەکرێن ئەگەر بۆ شـۆخی کـردنیش بێت، گفتوگۆکردنیش لە هەندێ مەسەلەدا قەدەغە دەکرێت، ئەگەرچی لە بواری لێکۆڵینەوەی راسـتو دروسـتیشـدا بێـت، لـە راسـتیدا رۆژئـاوا بـەدەرکردنی ئـەو جـۆرە یاسـایانە خراپـەی بەرامبـەر بـەخۆیو نـاوی دیموکراسـیەتو ئـازادی گوزارشتکردنو ئازادی بیروڕاش کردووە.

هەروەها رۆژنامەکانو دەزگا راگەیاندنەکانی رۆژئاوا شیاوی ئـەو نـاوو ناوبانگـەنین کـە پێـی ناسـراون، گوایـە ئەوانـە زێدی ئازادی رادەربڕینو گوزارشـتکردنن لـە جیهانـداو دەرگایـان والایـە بـۆ هـەموو رایـەكو گشـت فیکرێـك، لەبەرئـەوەی رۆژنامەگەریی لە رۆژئاوادا چەند هێڵێکی سووری هەیە کە ناتوانێت لێیان نزیك ببێتەوە، چ جای تێپەڕاندنو بەزاندنیان. بۆ ئـەوەی رووبـەڕووی تـوڕەیی رای گشـتییو نـارەزایی کەرتـە گرنگـەکانی کۆمەڵگـە نەبێتـەوە، هـەروەها کورتکردنـەوەی

موڵكیەتی دەزگاكانی ڕاگەیاندن لە بازنەیەكی زۆر دیاریكراوی پیاوە دەوڵەمەندو سەرمایەدارەكاندا وای لەو كەسانە كردووە تا ڕادەیەكی زۆر كۆنترۆڵی هەموو بابەتێكی ئیعلامیو ئەو لێكۆڵینەوە هەواڵیانە بكەن كە هاوولاتی ڕۆژئاوایی دەیان بینێت، یان گوێبیستیان دەبێت، یان دەیانخوێنێتەوە، بە شێوەیەكی وا وەختە وەك جۆرێك لە دەستبەسەردا گرتنی فیكریی لەناو كۆمەڵگەدا دەربكەوێت، هێندەش بەسە كە ئەوە وەبیر بخەینەوە بۆ نموونە كە تەنها پەنجا كۆمپانیا موڵكداریێتی زیاتر لە نیوەی هەموو دەزگاكانی ڕاگەیاندنی ویلایەتە یەكگرتووەكانی لە ئەستۆدایە، لە "كەنەدا"دا "كۆنراد بلاك"ی بلیۆنێر خۆی بە تەنها خاوەنی زیاتر لە نیوەی ڕۆژنامە ڕۆژانەكانە، هەروەها گروپە سەهیۆنیەكان لە هەموو ولاتانی ڕۆژئاوادا سەركەوتنێكی بەرچاویان بەدەستهێناوە لە بەكارهێنانی كەسە سەرمایەدارو دەستڕۆشتوەكان كە كۆنترۆڵی ڕاگەیاندنیان كردووە لە سەپاندنی چاودێرییەكی توند بەسەر هەموو ئەو شتانەوە كە پەیوەندییان بە ئیسرائیلەوە هەیە، بەشێوەیەك كە هاولاتی ڕۆژئاوایی ئەوەی كە پەیوەندی بە ململانێی نێوان عەرەبو ئیسرائیلەوە هەبێت جگە لە ڕووبینییەكانی ئیسرائیل هیچی تر نابینێتو نابیستێتو ناخوێنێتەوە، هەرگیز ڕووینەداوە كە ڕاستی كێشەی فەلەستینو ڕووبینی فەلەستینییەكان بەدەستپاكیو بێلایەنانە لە هیچ ڕۆژنامەیەكی ڕۆژئاوایی بەناوبانگدا خرابێتە ڕوو، بۆیە تائێستاش عەقڵی ڕۆژئاوایی بەشێوەیەك وێنای عەرەب دەكەن كە ئەو كۆمەڵە تیرۆرستەن دەیانەوێت ئیسرائیلی مێرگی ئارامیو قەڵای تاقانەی دیموكراسیەت لە ڕۆژهەڵاتدا وێران بكەن، هەروەها لێهاتوویی زوڕناكانی پڕوپاگەندەی سەهیۆنی لە گەماڕۆدانی عەقڵی عەرەبیدا گەیشتونەتە ڕادەیەك كە مایەی سەرسوڕمانە، بەشێوەیەكی وا لە ڕاپرسییەكدا كە لە مانگی ئایاری ساڵی (١٩٩٨)دا لە ویلایەتە یەكگرتووەكان ئەنجامدرا سەبارەت بە سەرنەكەوتنی پرۆسەی ئاشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، دەركەوت (٦٧٪)ی ئەمەریكییەكان لۆمەی لایەنی فەلەستینیان كردووە لەسەرنەكەوتنی ئەو پرۆسەیەداو (٤٣٪)ی ئەمەریكییەكانیش باوەڕیان وابووە كە ئیسرائیل لە سایەی سەركردایەتی كردنی (ناتانیاهۆ)دا هەنگاوی ڕاستەقینەی ناوە بەرەو جێگیركردنی ئاشتی لە ناوچەكەدا!.

لە ڕاستیدا سەركەوتنی گروپە سەهیۆنییەكان لە سەپاندنی چاودێری بەسەر هەموو ئەو شتانەدا كە پەیوەندییان بە ئیسرائیلەوە هەیە بە ڕوونی ئەوە دەسەلمێنێت كە تا چ ڕادەیەك گەردنی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا لە ژێر كۆنترۆڵی دەستی سەرمایەو ناوەندەكانی دەسەلاتدایە.

لە ڕاستیدا ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا بە دووی حەقیقەتدا ناگەڕێت، هێندەی ئەوەی بە دووی سودو قازانجدا دەگەڕێت، وە دەستپاكیو بابەتی بوونی لە لا مەبەست نییە هێندەی ئەوەی بڵاوبوونەوەو زیادبوونی دابەشكردنی لە لا مەبەستە، دەرگا بۆ ئازادی بیروڕاو گوزارشتكردن ناكاتەوە لەو سنوورەدا نەبێت كە بیسەرانی ئازیز داوای دەكەن!.

ڕۆژئاوا لە ئەمڕۆدا ئەگەرچی قەدەرێك ئازادی گوزارشتكردنی تێدایە كە زۆر زیاترە لە شوێنەكانی دیكە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شیاوی ئەوە نییە بكرێتە ئەو نمونەیەی چاوی لێبكرێت، لە ڕێزگرتنی ئازادی بیروڕاو گوزارشتكردنداو لەدەستپێكی هەزارەی سێیەمدا بكرێتە نموونە بۆ هەموو مرۆڤایەتی. ئەو حكومەتانەی كە یاسا دادەنێن بۆ دەستبەسەراگرتنی ئازادی گوزارشتكردنو بیركردنەوەی توێژەرو زانایان شیاوی ئەوەنین ببنە پێشەنگی جیهانی داهاتوو، چونكە ئەو یاسایانە لەگەڵ چاخەكانی تاریكیدا دەگونجێنو شایەنی سەردەمی شۆڕشی زانستو تەكنەلۆژیاو زانیارییەكان نین، ئەو ڕاگەیاندنەی گوزارشت لەحەزی گەورە سەرمایەدارەكان دەكاتو بە دوای ڕەزامەندی ناوەندەكانی سەروەتو سامانو دەسەلاتدا دەگەڕێت ناگونجێت ببێتە قەلای دەربڕینی ئازادانە، یان بڵندگۆی (ڕا) بابەتییەكان یاخود مەیدانی گفتوگۆكردنی فیكری بنیاتنەر، یان نموونەیەك بێت چاوی لێبكرێتو شوێنی بكەویت، هەروەها ئەو خۆ بە زلزانینە لە بەرامبەر كەسانی دیكەداو بەكەم تەماشاكردنی مومارەسەتەكانیان كە زۆر جیاوازییان لەگەڵ مومارەسە ڕۆژئاواییەكاندا نییە لە هەوڵدان بۆ كۆتكردنی گوزارشتە وروژێنەرەكان دەرگای دیالۆگی شارستانیەتەكان دادەخاتو تۆوی دوژمنایەتی دەچێنێتو هەڕەشە لە ئاشتی جیهانی دەكات، ئەو ڕۆژئاوایەی كە چەپڵە بۆ سەلمان ڕوشدی لێدەداو لە هەمان كاتیشدا "ڕۆجیە گارودی" تاوانبار دەكات ناكرێت پێشەوایەتی مرۆڤایەتی بكات بەرەو ئایندەیەكی باشتر، لە

ڕاستیدا جیهانی داهاتوو پێویستی بە نموونەیەکی باشتر لە نموونەی ڕۆژئاوا هەیە بۆ پاراستنی مافەکانو ڕاگرتنی یەکسانی ئازادییەکانو بەرپرسیارێتییەکانو ڕێزگرتنی هەستی کەسانی دیکە.

## ئێمەو ئازادی ڕادەربرین

نە دەستپاکییەو نە ویژدانداریشە ئەگەر ڕەخنە لە دیاردەکانی کەموکورتی لە نموونە ڕۆژئاواییەکەی مومارەسەکردنی ئازادی گوزارشتکردن بگرین بەبێئەوەی باس لە بارودۆخی ئازادی گوزارشتکردن لە جیهانی عەرەبیو ئیسلامیدا بکەین، لەوانەیە بەلای کەسەوە شاراوە نەبێت کە حاڵەتی ئازادی گوزارشتکردن لە جیهانی عەرەبیو ئیسلامیدا بەشێوەیەکی گشتی زۆر خراپە، تەنانەت وەختە ئازادی گوزارشتکردنو رادەربڕین وای لێبێت لە زۆربەی ناوچەکانی جیهانی عەرەبیو ئیسلامیدا لەو ئازادییانە لە قەڵەم نەدرێن کە هاوڵاتی مافی سوود لێوەرگرتنیان هەبێت، بەرتەسککردنەوەی هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەستن بە گوزارشتکردنی سیاسییەوە گەشتۆتە چڵەپۆپە، چونکە ڕەخنەگرتنی ئاشکرا لە حکومەتەکان یاساغەو ناڕەزایی دەربڕینی هێمنانە بە ئاژاوەنانەوە لە قەڵەم دەدرێتو خۆپیشاندانەکانیش بەگێرەشێوێنیو داواکردنی گۆڕینی رژێمی دەسەڵاتداریش تاوانە .. هتد، بەلام بەرتەسککردنەوەی ئازادی گوزارشتکردن بە تەنها لە ڕژێمە سیاسییەکاندا خۆی نابینێتەوە، چونکە چاودێری کردن مەسەلەیەکە پەیڕەوی دەکرێت لە لایەن ڕۆژنامەکانو زانکۆکانو قوتابخانەو دامەزراوە ئاینییەکانو پارتە سیاسییەکان، تەنانەت ئۆپۆزسیۆنەکانیشیان و جڤاتەکانو یەکێتییەکان بە جیاوازی جۆرو شێوەیانەوە، بەڵکو تەنانەت خێزانی گچکەش زۆرێك لە کۆتو بەند بەسەر ئازادی ڕادەربرینو گوزارشتکردنی ئەندامەکانیدا دەسەپێنێت، ئەم بەرتەسککردنەوەیە بەتەنها لە گوزارشتکردنی وروژێنەرو بریندارکەرو دوژمنانەدا کورت نابێتەوە، بەڵکو هەموو ڕا نەیارو جیاوازەکانیش دەگرێتەوە، تەنها لەبەرئەوەی کە جیاوازە، ژینگەی سیاسیو ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتی لە ناو کۆمەڵگەی عەرەبیو ئیسلامیدا سیخناخە بە جیاوازیو مایەی دڵخۆشی نییە، لە ڕای ئەوی دی هەڵدێتو ڕێزی ناگرێت، هەوڵدەدات بۆ بێدەنگکردنی ئەو کەسانەی لە ڕاکانیاندا جیاوازن، لە بریتی ئەوەی دیالۆگیان لەگەڵدا بکرێت، گومانی نییەت خراپیو مەبەستپیسییان لێدەکرێت، لە بریتی گومان پێبردنی باشەو بیانوو هێنانەوە بۆیان، ئەم بۆچوونە نێگەتیڤانە بەرامبەر بەڕای جیاواز بوەتە مایەی نەمانی ڕۆشنبیری دیالۆگکردنی نێوان خاوەن بۆچوونە فیکرییە جیاوازەکانو بە ئاسان تۆمەتبارکردنی ئەو کەسانەی ڕای جیاوازیان هەیە بە خیانەتو بەکرێگیراویو کوفر کردنو .. هتد.

جێی پرسیارو وروژاندنە کە بارودۆخی نەتەوەی ئیسلامی لەبەر تەسککردنەوەو فشار خستنە سەر ئازادی بیروراو گوزارشتکردن بەو ڕادەیە بگات، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەم ئازادییانە لە ئازادییە بنەڕەتییەکان دەژمێردرێن کە ئیسلام بانگەشەیان بۆ دەکاتو داوای جێبەجێکردنیان دەکاتو هەموو گرەنتییەکیشی بۆ پاراستنیان پێشکەش کردووە، ئەوەتا ئیسلام ئازادی عەقیدە دەبەخشێتە تەنانەت ئەوانەشی کە لەگەڵیدا جیاوازنو ڕایدەگەیەنێت زۆرکردن لە ئایندا نییە (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ)، لە پاشان بە هەموو شێوەیەك ئەوەش ڕەتدەکاتەوە کە مرۆڤ ناچار بکرێت بەوەی باوەڕ بە عەقیدە، یان مەزهەبێك بهێنێت کە بڕوای پێی نییە، ڕێگە دەدات ڕۆڵەکانی ئاینەکانی دیکە لەناو وڵاتانی موسڵماناندا بە ئازادیەکی تەواوەوە مومارەسەی دروشمە ئاینییەکانی خۆیان بکەن، ئازادی عەقیدە بریتیە لە دوانەی ئازادی فیکرو ئازادی (ڕا)، هەروەها ئازادی مومارەسەکردنی دروشمە ئاینییەکانیان جۆرێکە لە جۆرەکانی ئازادی گوزارشتکردن، لەبەرئەوە کاتێك ئیسلام بانگەشەی بۆ ئازادی عەقیدە کرد بۆ هەموان داوای پاراستنو دەست بۆ نەبردنیشی بۆ کرد، بەمەش گرەنتی ئازادی فیکرو ئازادی ڕادەربرین دەکات بۆ هەموو ئەوانەی بڕوایان بە ئیسلام هێناوە، یان ڕەتیان کردۆتەوە، کاتێك ئیسلام ڕێگەیدا بە خاوەن ئاینەکانی تر کە بە ئازادییەکی تەواوەوە مومارەسەی ئاینەکانی خۆیان بکەنو دروشمەکانیان بە ئاشکرا بڵێنەوە بەمەش ئازادی گوزارشت کردنی ئاشکراو ئازادی بۆ هەموان پاراستو بەرگری لێکرد، هەروەها موسڵمانەپێشینەکان ڕێزی ئازادی عەقیدەو فیکرو گوزارشتکردنی هەموو خاوەن ئاینەکانی دیکەیان گرتووە لە هەموو وڵاتێکدا کە ئیسلام ڕزگاری کردوە، بەشێوەیەکی وا بەرلەوان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا وێنەی نەبووە، زیاد لەوەش

ئیسلام داندەنێت بە فرەیی عەقیدەو فیکرو ڕۆشنبیری نێوان مرۆڤەکاندا، بەڵکو ئەوە لە هێماکانی دەسەڵاتی خوای گەورە لە دروستکراوەکانیدا لێکدەداتەوە، قورئانی پیرۆز جەخت لەسەر مەحاڵ بوونی کۆتایی هێنان بە جیاوازییەکانی نێوان مرۆڤەکان دەکاتەوە، ئەوەش ڕوون دەکاتەوە کە ئامانج لە فرەیی و هەمەچەشنی نێوانیان یەکترناسینی مرۆڤەکانە لە نێوان خۆیاندا، بێگومان ئەمەش بەبێ دیالۆگ و ڕێزگۆڕینەوەو داننان بە مافی یەکتریدا لەوەدا کە جیاوازبن نایەتەدی، هەروەها فیقهی ئیسلامیش دەرکی بە جیاوازی فیکریی نێوان ڕۆڵەکانی یەك ئاینیش کردوەو مومارەسەی کردوەو ڕێزیشی گرتووە، لەبەرئەوەشە مەزهەبەکانیش زۆربوون و بۆچوونەکان جۆراوجۆر بوون و سەردەمانێکی دورو درێژیش هەرکەسەو لەگەڵ ئەوی تردا بە لێبوردەیی و ئاشتیانە پێکەوە ژیاون، لەبەرئەوە جێگەی داخ و سەرسوڕمانە کە سەردەمێك بۆ موسڵمانان بێتە پێشەوە تیایدا بە جیاوازی ڕای نێوانیان سنگیان بەرامبەر بە یەکتر تەنگ ببێتەوە، بەو شێوەیەی کە ئەمڕۆ دەیبینین.

هەروەها بە ڕاستی مایەی سەرسوڕمانە کە بارودۆخی ئازادی گوزارشتکردن لەناو گەلانی موسڵماندا بگاتە ئاستی ئەو حاڵەتە تاقەت پڕوکێنەی کە ئەمڕۆ ئەو ئوممەتەی تێدا دەژی، چونکە ئازادی گوزارشتکردنی سیاسیی لە بۆچوونی ئیسلامەوە بەیەکێك لە مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ دەژمێرردرێت کە خوای گەورە بۆ مرۆڤی دیاریکردووە. لەبەرئەوە قورئانی پیرۆز ڕەخنەی توند ئاراستەی سیستەمی سیاسی فیرعەون دەکات کاتێك کە تەنها یەك کەس تیایدا سوور دەبێت لەسەر ڕای خۆی و بڕواشی وایە ئەوەی ئەو دەیبینێت هەر ئەوە حەقیقەتێکی ڕەهایەو هەر بە تەنهاش ئەو دەزانێت کە بەرژەوەندی خەڵکە ڕەشۆکەکە لە کوێدایەو جگە لە خۆیشی هیچ ڕاو ئامۆژگارییەکی دیکەی پێ قبوڵ نییە کە بەپێچەوانەی حەزو خۆشییەکانی خۆیەوە بێت!، بۆیە ئیسلام وەك ئەلتەرناتیڤێکی فیرعەونیی و سەرکوتکاری ڕا، سیستەمی شوورای بۆ دەسەڵات پێشنیاز کرد، قورئانی پیرۆزیش زیاتر لە جێگەیەکدا پێویستبوونی شوورای خستۆتە ڕوو، تەنانەت فەرمانیداوە بە پێغەمبەر(ﷺ) کە لەگەڵ هاوەڵەکانیدا پابەند بێت بەشووراو ڕاگۆڕینەوەوە، بۆ ئەوەی لە پاش خۆی ئەو نموونەیەش ببەخشێتە نەتەوەکەی، ئیسلام سیستەمێکی سیاسی دیاریکراوی بەسەر موسڵماناندا نەسەپاندووە، ئەمەش بۆ ئەوەی مەسەلەی هەڵبژاردنی دەسەڵاتدارو چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت بۆ بڕیاری شوورا لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا بەجێبهێڵێت، دەسەڵاتی نەکردۆتە پشتاوپشت پێکردن، تەنانەت لەناو خێزانەکەی پێغەمبەریشدا، پیرۆزییەکی تایبەتیشی نەبەخشیوەتە هیچکام لە هاوەڵەکانی، یان هەر کەسێك کە لە پاش خۆی بێت، هەروەها ئیسلام بنەمای بوونی دامەزراوەیەکی ئایینی پیرۆزی ڕەتکردۆتەوە کە بانگەشەی بێگوناهی و بێتاوانی بکات، یان بەناوی خواوە لەسەر زەویدا قسە بکات و دەسەڵاتی خۆی بەسەر کۆمەڵگەدا بسەپێنێت بەناوی مۆنۆپۆڵکردنی حەقیقەتی ئاینییەوە. پاشانیش شوورا لە ئیسلامدا کرایە تاکە ڕێگەیەك بۆ گەیشتن بە بڕیاری سیاسی لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵگەدا، شتێکی بەڵگە نەویستە کە شوورا بە هەموو شێوەیەك مانای خۆی لە دەستدەدات ئەگەر هات و ئازادی گوزارشتکردن بوونی نەبێت، چونکە ئیتر هیچ بەهاو ئەرزشێك بۆ شوورایەك نامێنێت کە کەسانێك بیخەنەڕوو نەتوانن بە ئازادی گوزارشت لە ڕاکانی خۆیان بکەن، زیاد لەوەش ئیسلام هانی موسڵمانانی داوە بە ئازادی گوزارشت لە ڕاکانی خۆیان بکەن و فەرمانیداوە وەك یەك ئامۆژگاری دەسەڵاتداران و خەڵکی بکەن و مەدحی ئەو کەسانەشی کردوە کە حەقیقەت ئاشکرا دەکەن و لە گوزارشتکردنی ڕاکانیاندا لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسن، هەروەها گوزارشتکردنیشی بەزمان و قسەکردن لە یەکێك لەو ئامڕازانە داناوە کە خراپەکاری دەگۆڕن، ئەوەتا پێغەمبەر (ﷺ) وەك نموونەیەك دەخاتە پێش چاو بۆ ئوممەتەکەی لە هاندانی هاوەڵەکانیدا بۆ دەربڕینی ڕاکانیان، تەنانەت دابەزینیش بۆ ئاستی ڕای جیاواز وەك ئەوەی لە جەنگی (ئوحود) [1] دا ڕوویدا.

پێغەمبەری خوا لە ڕۆژی پەیمانی حودەیبییەدا لۆمەی هاوەڵەکانی نەکرد، کاتێك سەبارەت بەو پەیمانە لەگەڵیدا جیاوازو نەیار بوون بە کوفرو سەرپێچیکاریش تۆمەتباری نەکردن، بەڵکو ئەوەی بۆ ڕوونکردنەوە کە هەڵوێستی ئەو

[1] ـ هێندەی ئاگاداربم پێغەمبەر (ﷺ) لە جەنگی بەدردا پلانەکەی خۆی گۆڕی و ڕای یەکێك لە هاوەڵەکانی پەسەند کرد بۆ پلانی جەنگەکە، بەڵام ـ نووسەری دەقە عەرەبییەکە جەنگی ئوحودی ناوهێناوە. "وەرگێڕ".

بەرامبەر بەو پەیمانە لەگەڵ قورەیشدا بە وەحی پشتگیری لێکراوەو قورئانیش هاتۆتە خوارەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوەو پەیمانەکە پیرۆز دەکاتو بە سەرکەوتنێکی ئاشکراو دیاریشی لە قەڵەم دەدات[1]. سەرەڕای ئەوەش قورئانی پیرۆز ڕەخنەی لە هەڵوێستی موسڵمانان نەگرت لە گوزارشتکردنی ئازادانەیاندا بۆ ڕازی نەبوون بە پەیمانەکە لە سەرەتای مەسەلەکەوە.

تەنانەت ژنیش لە کۆمەڵگەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) گران نەبوو بەلایەوە لەوەدا بڕواتە لای پێغەمبەری خوداو لەبارەی سوێندێکەوە پرسیاری لێبکات کە مێردەکەی بەرامبەری خواردبووی‌و پاشان ئەو ژنە ڕای لەگەڵ ڕای پێغەمبەری خوادا جیاواز دەبێت لە مەسەلەکەداو بەردەوام موجادەلەی لەگەڵدا دەکات تا ئەو کاتەی قورئان دێتە خوارەوە و ڕای ژنەکە پەسەند دەکات.. لێرەدا ئەوە دەردەکەوێت کە نە ژنەکە شەرمی لەوەکرد بە ئاشکرا ڕای خۆی بڵێتو لەگەڵ پێغەمبەردا بکەوێتە گفتوگۆ لەسەری، نە پێغەمبەریش (ﷺ) تووڕە بوو لەوەی کە ژنەکە لە ڕادا لەگەڵیدا جیاوازە، لە ئاکامی ئەم پەروەردەی مومارەسەکردنی شووراو ڕادەربڕینەدا بوو کە هاوەڵەکان بنەمای شوورایان لە هەڵبژاردنی چوار خەلیفە ڕاشیدینەکەدا پاش پێغەمبەری خوا بەکارهێنا، ئەو ڕایانە بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە بە هەموو ئازادییەکەوە ڕووبەڕووی گفتوگۆو موناقەشەکردن دەبوونەوە، بۆ نموونە (سەعدی کوڕی عوبادە) خەلیفایەتی کردنی ئەبوبەکری صدیقی ڕەتکردەوەو پێی ڕازی نەبوو، تەنانەت پاش هەڵبژاردنی ئەبوبەکر بە خەلیفە سەعد (مەدینە)ی بەجێهێشت، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کەسێك بە کوفرو خیانەتکردن تۆمەتباری نەکردو خەلیفەش لەسەر ئەو نەیار بوونەی هیچ سزایەکی نەدا، زیاد لەوەش ئەندامانی کۆمەڵگە بە هەموو ئازادییەکەوە گوزارشتیان لە ڕای خۆیان دەکرد، تەنانەت لە ڕووی خەلیفەشدا، ئەوەتا هەندێك لە هاوەڵە گەورەکان ناکۆك بوون لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتابدا لە مەسەلەی دابەشکردنی زەوی لەو وڵاتانەدا کە ئیسلام ڕزگاری دەکردن، بۆیە عومەر هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێت داوای بەستنی ئەنجومەنێکی ڕاپرسی (شوورا)ی کرد لەو کەسانەی شارەزاو خاوەن ڕان لە ناو دەوڵەتی ئیسلامیدا، ئەوە بوو بە هەموو ئازادییەکەوە لە لایەن هەردوولاوە گفتوگۆیەکی تێرو تەسەل لە بارەی مەسەلەکەوە کرا تا ئەوەی ئەنجومەنەکە گەیشتە بڕیارێك، جگە لەوەش زۆرێك گێڕانەوە سەبارەت بە ئەندامانی ڕەشۆکی ناو کۆمەڵگە ناوبانگیان دەرکردوە کە بە ئاشکرا ڕەخنە ئاراستەی خەلیفە دەکەن، ئەوەتا یەکێك پرسیار لە عومەری کوڕی خەتتاب دەکات لەسەرچاوەی ئەو کراسە درێژەی کە لەبەری کردوە، ژنێکیش هەڵە بۆ عومەر ڕاست دەکاتەوە، لە کاتێکدا کە ئەو لەسەر مینبەرەو هیچ گرانییەکیش لەوەدا نابینێت کە دان بە هەڵەکەی خۆیدا بنێتو ڕاستی ڕەخنەی ژنەکەش بسەلمێنێت.. هتد.

بەڵام ئیسلام بەو شێوەیە سەیری ئازادی مرۆڤی نەکردووە لە گوزارشتکردن لە خودی خۆی‌و بیروڕاکانی کە ئازادییەکی ڕەها بێتو هیچ سنوورێك دیاری نەکات، یان بێ دیسپلین بێت، بۆ نموونە ئیسلام بوختانکردن بۆ ڕێزو کەرامەتی ئینسان بە تاوان لەقەڵەم دەدات کە شیاوی سزایەکی توندبێت، قورئانیش سوکایەتیکردنو تانەو لەکەدارکردنی مرۆڤی قەدەغە کردووە چ لە ڕووی خۆیاندا بێت یان لە پاش ملەیان، هەروەها ڕێگریشی کردووە لەوەی کە خەڵکی بە جۆرە ناوو نازناوێك بانگ بکرێن کە پێیان ناخۆشە.. هتد، هەروەها ئیسلام هەموو جۆرەکانی جنێوو ناشیرین کردنو خراپەکاری لە وتەو کردەوەدا حەرام کردوە، هەروەها ئیسلام زۆر بە توندی سووربونی خۆی لەسەر ئاشتی‌و پێکەوە ژیانی کۆمەڵایەتییانە دووپات کردۆتەوەو جەختیشی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە هەموو مرۆڤەکان هەروەك دانەکانی شانە یەکسانن‌و وەك یەکن، هیچ ڕەگەزو ڕەنگێك فەزڵی بەسەر ئەوەی دیکەوە نییە، ڕێگریشی لەوە کردووە کە نەتەوەیەك گاڵتە بەنەتەوەیەکی تر بکات، یان گروپێك بە گروپێکی دیکە، جگە لەوەش ئیسلام داوای لە شوێنکەوتوەکانی کردووە کە جنێوو قسەی ناشیرین بەرامبەر بە ئایینەکانی دیکە، یان ئەو خوداوەندانەی کە دەیانپەرستن نەکەن.

هەروەها ئیسلام ڕیگریشی لە هەموو جۆرە گوزارشتکردنێك کردووە کە ببێتە مایەی وروژاندنی حەزە خراپەکان، یان

[1] ـ ئایەتی (١) لە سورەتی (الفتح) "انا فتحنا لك فتحا مبينا". "وەرگێڕ".

بڵاوبوونەوەی هەڵسوکەوتی بێ ئابڕوانەو نائەخلاقی لەناو کۆمەڵگەدا. هەروەها ئیسلام بۆچوونێکی ڕوونی خستۆتەڕوو بۆ سوودو ڕۆڵی ئازادی گوزارشتکردن لە کۆمەڵگەداو چۆنیەتی مومارەسەکردنی و ئەو دیسپلینانەی کە پێویستە پەیڕەوی لێبکرێت بۆ ئەوەی مافی مرۆیی تاکەکان مسۆگەر بکات لە گوزارشتکردنی ئازادانەدا، بەبێئەوەی کاریگەری سلبی بۆ ئاسایش و سەلامەتی و ڕەوشتەکانی ناو کۆمەڵگە هەبێت، کەواتە ئەو مومارەساتە نادروستانەی لە ئازادی ڕادەربڕین و گوزارشتکردندا کە ئەمڕۆ لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا پەیڕەو دەکرێن پێویستە بەو شێوەیە تەماشا بکرێن کە ئەوانە لادانن لە بەهاو نموونە باڵاکانی ئیسلام، نەوەك ئاکامی پابەندبوون بێت بە ئیسلامەوە.

## دوا وتە

گومانی تێدا نییە کە مافی گوزارشتکردنی مرۆڤ لە خودی خۆی و هەستەکانی و ڕاو بیروباوەڕەکانی لە پیرۆزترین مافە مرۆڤایەتییەکانن کە پێویستە بەرگری لێبکرێت و بپارێزرێت، لە هەر شوێن و کۆمەڵگەیەکدا بێت کە ڕێزی مرۆڤانەی مرۆڤی تێدا بگیرێت، بەهای گوزاشتکردنی ئازادانە تەنها لەلایەنە مرۆڤانەکەیدا کورت نابێتەوە، چونکە سوودە سیاسیی و زانستیی و ڕۆشنبیریی و هونەرییەکانیی هێندە زۆرن لە ژماردن نایەن، بۆ نموونە دیموکراسیەت بەبێ ئازادی ڕادەربرین بوونی مەحاڵە، ئەگەرنا دەنگدەران چۆن دەتوانن لە نێوان پارتە جیاوازەکاندا حکومەت هەڵبژێرن، ئەگەر هەموو حزب و بیروراو لایەنە سیاسییەکان ئەوەیان بۆ دەستەبەر نەکرابێت کە بە ئازادییەکی تەواوەوە بەرنامەی خۆیان بخەنە پێشچاوو پلان و بۆچوونەکانی خۆیان ڕون بکەنەوە؟، چۆن بوار بۆ گەل دەڕەخسێت کە چاودێری حکومەت بکات و ڕێگە لە لادانەکانی بگرێت ئەگەر ڕۆژنامەیەکی ئازادو ئۆپۆزسیۆنێکی ئازادو گفتوگۆیەکی پەرلەمانی ئازاد لە ئارادا نەبێت؟، چۆن دەتوانرێت حکومەت ناچار بکرێت وەڵامی داواکارییەکی جەماوەر بداتەوە ئەگەر ئازادی گوزارشتکردن لە ناو کۆمەڵگەدا نەمێنێت؟، جگە لەوەش داهێنراوە زانستییەکان و دەستڕەنگینییە هونەرییەکان و داهێنانە ئەدەبییەکان مەحاڵە لە کۆمەڵگەیەکدا ببوژێنەوە کە ڕێز بۆ مافی هەر مرۆڤێك دانەنێت لە گوزارشتکردنی ئازادانەدا، بەڕاستی هەلڕەخساندن بۆ بیروڕا جیاوازەکان بۆ ئەوەی بە ئازادی گوزارشت لە خۆیان بکەن تاکە ڕێگەیەکە کە گرەنتی ئەوە دەکات هەموو دەستەو دامەزراوە سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکان هەموو زانیاری و فیکرو پێشنیارو ئەلتەرناتیڤە جیاوازو پێویستەکانی بۆ بڕەخسێت لە پێناوی دەرکردنی بڕیارەکان و چاودێری کردنی زیادەڕۆییەکان و ئاشکرا کردنی هەڵەکان و گەیشتن بە باشترین چارەسەرو هێنانەدی پێشکەوتن و بەردەوامی گەشەسەندن، هەروەها ئازادی گوزارشتکردن دەرگا لەبەردەم نەیاربوونی ئاشتیانەو ڕای جیاوازدا والا دەکات، کە ئەمەش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی هەلی پەنابردنەبەر توندوتیژی سیاسی و کۆمەڵایەتی، لە ڕاستیدا جێگیربوونی سیاسیی و گەشەسەندنی ئابووریی و ئاشتیی کۆمەڵایەتییانەو داهێنانی رۆشنبیریی و پێشکەوتنی زانستیی بەدی نایەت تەنها لە ژینگەیەکدا نەبێت کە پێشوازی لە گوزارشتکردنی مرۆیی ئازاد دەکات، لەبەرئەوە ئازای گوزارشتکردن بە مافێك لە مافەکانی کۆمەڵگە دەژمێرردرێت، بەرلەوەی مافێك بێت لە مافەکانی مرۆڤ.

ئەوەش هەڵەیە کە وابزانرێت ئازادی گوزارشتکردن پێویستە ڕەهاو بێ کۆت و مەرج بێت، چونکە ئازادی بەبێ بەرپرسیارێتی بوونی نابێت، گوزارشتکردنی مرۆیی زۆرجار زیانەکانی سوودەکانی تێدەپەڕێنێت، بەڵکو لەوانەشە هەڕەشە لە سەلامەتی تەواوی کۆمەڵگەش بکات، لەوکاتەدا دانایی ئەوە دەخوازێت و تەناتە پێویستیشە ڕێوشوێنی گونجاو بگیرێتە بەر بۆ لەقاڵبدانی ئەو گوزارشتە زیانبەخشانە، پێویستیشە بەو چاوەوە سەیری ئەو دیسپلین و ڕێ و شوێنانە نەکرێت کە هەڵسوکەوتێکی نائەخلاقی و سلوکێکی ناشارستانییە کە لە لایەن حکومەتەکان و کۆمەڵگاکانەوە دەگیرێتەبەر، چونکە ئەو سنووردانان و بەستنەوەیە لەوانەیە تاکە ئامڕازی پاراستنی هەموو کۆمەڵگە بێت لە زیانەکانی گوزارشتکردنی نامەسئولانە، بۆ نموونە ئەگەر یاسای بەریتانی پارێزگاری لە پیرۆزییەکانی ئیسلام بکردایە لە سووکایەتی پێکردن وەك ئەوەی بەرامبەر پیرۆزییەکانی مەسیحییەت پەیڕەوی دەکرێت ئەو کاتە لەوانەیە هیچ بلاوکارێك

نەدەهاتە پێشەوە بۆ بڵاوکردنەوەی کتێبی (آیات شیطانیة)، بەمەش بەریتانیاو جیهان لە ئاکامە خراپەکانی ئەو کردەوە توندوتیژیانە پارێزراو دەبوون کە بە هۆی کتێبەکەوە ڕوویاندا، تەنانەت خودی سەلمان ڕوشدی نووسەری کتێبەکەشی دەپاراست لە مەترسی تیرۆرکردن، کە تا ئێستاش لە هەموو ساتێکدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە، بەڵام بانگەشەکردنی کۆمەڵگە لەوەدا کە دەبێت ئەو ئازادییە لە پلەیەکی پێگەیشتنی وەهادا بێت ڕێگە بدات بە ئازادییەکی ڕەهای گوزارشتکردن‌و مامەڵە لەگەڵ گوزارشتی بریندارکەرو وروژێنەرو نائەخلاقیدا بکات لەبەرپەرچدانەوەو دیالۆگدا ئەوە بانگەشەیەکی نا واقیعی‌و زێدە ڕۆییە لە ئایدیالیزمیدا، چونکە سرووشتی مرۆڤەکان وایە کە کاریگەریان لەسەر دروست دەبێت‌و ئازار دەچێژن‌و تووڕە دەبن، گوزارشتکردنی بریندارکەر لەوانەیە ببێتە مایەی بەرپابوونی کردەوەی توندوتیژی وەها کە دەکرێت زیانەکانی زۆر لە سەرووی هەر دەستکەوتێکەوە بێت کە لە ئاکامی ئازادی ڕەهای گوزارشتکردنەوە بێتە دی، هەروەها ئەو گوزارشتکردنەی کە هەڕەشە لە ئاسایشی نیشتمان‌و ڕەوشتی گەنجەکان بکات ناتوانرێت بەدیالۆگ چارەسەر بکرێت‌و گفتوگۆکردنیش تیایدا بێسوود دەبێت‌و دەبێت سروشتی مرۆیی ڕێزی لێربگیرێت‌و بەو شێوەیە مامەڵەی لە تەکدا بکرێت کە خۆی هەیە، بە دوور لە ڕۆچوون لە ناو میسالیەت‌و بیرکردنەوەی ناواقیعیدا.

بەڵام پێویستیشە ئەو کۆت‌و بەندانەی سەر ئازادی گوزارشتکردن بۆ حاڵەتێکی دیاریکراو بن، نەوەك بکرێتە بنەماو بنچینە، ڕۆڵی بنەڕەتیی لەوەدا تایبەتە بە نووسەران‌و ڕۆژنامەنووسان‌و بیریاران‌و هونەرمەندان‌و ئەدیبان‌و بڵاوکاران کە پێویستە دەرکی ئەو بەرپرسیارێتییە کۆمەڵایەتییە بکەن کە لەسەرشانیانە، لەبەرامبەر خراپ بەکارنەهێنانی ئازادی گوزارشتکردن، باشترین چاودێریش ئەوەیە کە بەخۆی لە ویژدانی نووسەرو دەرککردنی بە ڕۆڵی کۆمەڵایەتیانەی خۆیەوە هەڵدەقوڵێت، پاشان ئەوەی کە ڕای گشتیی‌و دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی مومارەسەی دەکەن، نەك ئەوەی کە بە زۆرو هێزی یاسا بسەپێنرێت، لەبەرئەوە پێویستە دەوڵەت بەهیچ کام لە دەسەڵاتەکانی جێبەجێکردن‌و یاسادانان‌و قەزاییەوە دەستوەرنەداتە ناو ئەو مەسەلەیەوە، تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێت کە زۆر پێویستە، بەمەرجێك دەستێوەردانەکەش ئەو سنوورە تێنەپەڕێنێت کە بۆ ڕێگرتن لەو زیانانە دانراوە، کە لەوانەیە لە ئاکامی هەندێك جۆری گوزارشتکردندا سەر هەڵبدەن. هەروەها نەشبێتە هەوڵێك بۆ بێدەنگکردنی دەنگە نەیارەکان، یان دەستگرتن بەسەر مافی بیریاران‌و لێکۆڵەران‌و زانایاندا لە خستنەڕووی بیروڕاو پێشنیارەکانیان لەسەر کۆمەڵگە، هەروەها پێویستە دەستێوەردانی دەوڵەت دیموکراسییانە بێت‌و ڕای گشتی لەپشتەوە بێت بۆ پەسەندکردنی، نەوەك دەستپێشخەرییەك بێت لە لایەن دەسەڵاتدارو دەستڕۆیشتووەکانەوە بخرێتە ڕوو بۆ بێدەنگکردنی ئەو ڕایانەی کە ئەوان بە دڵیان نییەو حەزیان پێناکەن.

ئازادی گوزارشتکردن بەگژاچوونەوەیەکی زۆر ناڕەحەت بەسەر کۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا دەسەپێنێت، لەبەرئەوە ڕاگرتنی هاوسەنگی لە نێوان مافی تاکەکان لە گوزارشتکردنی ئازادانەو بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی بۆ ئەو گوزارشتکردنە کارێکی ئاسان نییە، سنووری جیاکەرەوە لە نێوان ئازادی‌و هەندێکجار دەستنیشانکردنی لەوانەیە کارێکی قورس‌و گران بێت، بە دەستخستنی ڕۆژنامەیەکی ئازادو سەربەخۆ لە دەسەڵاتی حکومەتەکان‌و ساماندارەکان کارێکی زۆر قورسە، گەورەکردنی ئەو دەستکەوت‌و سوودانەی کە لە گوزارشتکردنی ئازادەوە دەکەونەوە لەگەڵ کەمکردنەوەی ئەو زیانانەی کە لێیەوە سەر هەڵدەدەن کارێکی ئاسان نییە، بەڵام کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان لە دەستپێکی هەزارەی سێیەمدا هیچی تری لەبەردەمدا نییە جگە لەوەی کە بەڕووی ئەو بەگژاچوونەوانەدا بوەستێت‌و چارەسەری گونجاو بۆ ئەو جیاوازییانە بە ئازایانەو داناییەوە دابنێت، بۆ ئەوەی هاوسەنگی لە نێوان ماف‌و ئەرکەکان‌و لە نێوان ئازادییەکان‌و بەرپرسیارێتییەکاندا بهێنێتەدی‌و سوودەکەشی وەك یەك بۆ تاك‌و کۆمەڵگە بگەڕێتەوە.